# شەوانی
# گوی ئاگردان



نوسینی
جەلال تەقی

بەرگی یەکەم

جەلال تەقی

بڵاوکراوەی خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا

زنجیرە ٧٧

ناونیشان / سلێمانی –شەقامی گۆران – فەرعەکەی صابونکەران- بازاڕی سلێمانی – تەنیشت کتێبخانەی ئەوقاف

مۆبایل ناسیا ٠٧٧٠١٥٧٥٠٦٧ – سانا ٠٧٣٠١١٢٨٣٨٨

نرخی ٢٠٠٠ دینارە

هەبوو... نەبوو

هەبوو.....نەبوو

# شەوانی گوێ ئاگردن

## کۆمەڵە چیرۆکێکی فۆلکلۆری کوردییە

## کۆکردنەوەی جەلال تەقی

## بەرگی یەکەم

بەناوی خوای گەورە

## پێناسی کتێب

ناوی کتێب: شەوانی گوێ ئاگردان

بابەت : کۆمەڵێ چیرۆکی فۆلکلۆری کوردییە

کۆکردنەوەی: جەلال تەقی

تایپ: ئاشاد کوختی

نۆبەتی چاپ : چاپی دووەم سلێمانی ٢٠٠٦

شوێنی چاپ : چوارچرا

تیراژ : ١٠٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن ( ٦٨١) ساڵێ ( ٢٠٠٦)

# پێشەکی

چیرۆك وداستان وئەفسانەی فۆلکۆریی هەرچەندە کۆن بن و لەسنوری زانین و بیرو ڕای ئەم سەردەمەدا نەبن هەرزیندون و هەتا گەل مابێ ئەوانیش لەدڵ و مێشکدا ئەژین و ئەوەی ئێستاو داهاتوو لەدەسەلات و زانینی ئەوەی ڕابردووی کۆن ئاگادار ئەکەن, بۆیە فۆلکلۆر بنچینەی زانینی ئەدەبی هەموو چەرخێکەو هەرواش ئەمێنێتەوە .

هەرلەمنداڵی یەوە لەهەموو شتێك پتر حەزم لەچیرۆکی ئەفسانەیی و((گوێ ناگردان)) ئەکردوبەڕۆژیش هەر خەیاڵم لێ ئەکردەوە... باجی ئامینەیەك دراوسێمان بوو گۆڕەکەی پڕبێ لەڕوناکی- کانگایەکی کۆتایی نەهاتووی چیرۆکی کۆنی کوردەواری بووو هەموو شەوێك, بەتایبەتی شەوانی زستان, هەتا درەنگ چیرۆکی بۆ ئەگێڕاینەوە ... شێوەی گێڕانەوەو دەست جووڵاندنی واقیان ووڕئەهێنام وفزەم لەخۆم ئەبڕی هەتا لێ ئەبووەوەو وەك لەسەر کاغەز ئەو چیرۆکانە لەمێشکمدا نەخش ئەبوون و لەماوەی بیست و پێنج- سی ساڵەی دواییەدا زیاتر لەهەمووشتێك لەمێشکمدا خولیان خواردەوەو تیایدا پتر چەسپاون.

ئەو باجی ئامینە کەدواجار لەدەوروبەری ساڵانی ١٩٥٥ دا بینیم تەمەنی نزیکی پەنجا ساڵ ئەبوو, نەخوێندەوارو لاوازو باڵا مام ناوەندی بوو و بەدەگمەن پێ ئەکەنی و زیاتر بەکزی وپەستی ئەمایەوە. لەبەر ئەوەی ئەسمەرێکی تێربوو پێ یان ئەووت ((ئامە قوله)), بەڵام وەنەبێ ئەم ناوەی

بۆ ئەنگی لێ نرابێ، لام وایە زیاتر لەبەر خۆشەویستی بووبێ، چونکە هەرچەندە دەست کورت و هەژار بوو بەڵام لای هەموان خۆشەویست بوو، و بەسەر بەرزی ئەژیا، سەرەڕای ئەوەش گێڕانەوەی چیرۆکی گوێ ئاگردان ئەوەندەی ترخۆشەویستی کردبوو !.

ئەو چیرۆکانەی لەم بەرگەدا کۆکراونەتەوە، ئەوانە نەبێ کە دەست نیشان کراون، هەمووی هی ((باجی ئامینەیە))و ئەولەکاتی خۆیدا بۆی گێڕاومەتەوە. سەیر ئەوەیە زۆربەیان شەقڵێکی لەیەک چوویان پێوەیەو هەندێجار ڕا بۆنەوە ئەچێ کەمرۆڤ بوێرێ بڵێ دوورنیە سەرچاوەکانیان یەک کەس بێت یان چەند ڕووداوێکی ڕاستەقینە بوو بن بە بنچینە بۆ لەیەک چوونیان، بۆ وێنە: لەزۆربەی‌یاندا- هەروەها لەزۆربەی چیرۆکی ئەفسانەی کوردی‌دا بەتێکڕایی- پیرێژن نیشانەی خراپەکردن‌وتاوانە بەڵام نەک لەڕێی سامان‌و پارەدا بەڵکو لەڕێی شتێکی بێ نرخی وەک ((لەتک‌وپەتک))دا. لێرە پرسیارێک دێتە گۆڕێ، ئایا ئەو لەتک‌و پەتکە هەمان لەتک‌و پەتکە کە ئێستائێمە تێی ئەگەین یان شتێکی لەمە جیاوازەو ئەو پیرێژنانە لە((فڕینی چەرخ‌وفەلەک))دا بەئاسمان دا بەکاریان هێناوە؟ چونکە زوربەی کات ئەو پیرێژنەی خۆی ئەخاتە مەترسی یەوە لەڕێی پەیداکردنی ((لەتک‌و پەتک))دا خاوەنی((چەرخ‌وفەلەک))ێکەکە هەرکاتێ ویستی سواری ئەبێت‌و خەڵکی تریش سوارئەکات‌و بەئاسمان دا ئەفڕێ.

ئەمەش ئەمانگەیەنێتە پرسیارێکی سەیرتر: ئەگەر ئەوە ڕاست بێ کە هەندێک زانایان ئەڵێن گوایا لە ڕابووردووی زۆر دوورداو پێش پەیدابوونی فڕۆکە بەهەزارەها ساڵ‌و پێش ئەم شارستانیەتەی ئێستا مرۆڤ توانیویەتی

بە ئاسمان دا بفڕێ ئەڵێم ئەگەر ئەمە ڕاست بێ گومان لەوەدا نامێنێ كە كوردیش پلەی زانیاری هێندە بەرزبوە كەبەشداری لەو كارە زانیاری یەدا كردوە چونكە بەدەگمەن چیرۆكی درێژی ئەفسانەیی كوردی هەیە باسی چەرخ‌وفەلەك نەكان... بۆیە هیچ سەیرنیە كە زانای سۆفێتی ((ئەلیكساندەر گەرپۆفسكی)) بەدڵنیایی یەوە ئەڵێ: ((... ئاری یە كۆنەكان... توانیویانە بفڕن.))[1] خاڵێكی تری لەیەك چووی زۆربەی چیرۆكی ئەفسانەیی كوردی ئەوەیە كەلەو چیرۆكانەدا هەر شارە پادشایەكی هەیە فەرمانڕەوایی ئەكات، ئایا ئەمە نیشانەی بوونی سەربەخۆیی و دەسەڵاتداریی نیە لەو كاتە دێرینانەدا كە ئەم چیرۆكانەی تێدا دروست بوون؟.

دوا خاڵی لەیەك چوونی چیرۆكەكان، كەلە هەموویان گرنگترە، ئەوەیە كەنیشانەی مرۆڤایەتی تێكڕایی هەموویان بەیەكەوە ئەبەستێتەوەو ئەویش بریتی یە لەسەركەوتنی چاكەو ژێركەوتنی خراپە.

---

[1] ا.گەربۆفسكی: نهێنی كۆنترین مێژوو. وەرگێڕی لە ڕوسی یەوە جەلال تەقی سلێمانی ١٩٨٠، ل ١٧٨.

# خوێندەواری بەڕێز!

نامەوێ سەرت بیەشێنمو زۆری لەسەر بڕۆم, ئەوەندە هەیە, هیوادارم بتوانم لەومپاش بەرهەمی تری لەم چەشنە, کەمولکی هەمووانە, پێشکەش بەتۆی بەڕێز بکەم... زۆر بڕوام بەتینە کە هەرکەسێك لەلای خۆیەوە ئارەزوو بکات چیرۆکی لەم چەشنە ئەزانێتونەتوانێت تۆماریان بکاتو لەفەوتان ڕزگاریان بکات.

لەکۆتایی دا ئەلێم: ئەی خوێنەری بەڕێزی دڵ فراوان, بزەی گاڵتە پێکردن نەتگرێو مەڵێ(( چۆن لەسەدەی چوونە ئەستێرەکان دا تازە باسی دێوو درنج مان بۆئەگێڕێتەوە.... )) چونکە لەوە دڵنیام کە ئەگەرلەڕابردووی زۆر دووردا چیرۆکی ئەفسانەیی لەناو گەلاندا نەبوایە ئێستا نەئەتوانرا نهێنی ئاسمانو گەردوون ئاشکرا بکرێت... هەر ئەو چیرۆکانەشن کە مردنیان بۆنیەو لەهەموو بەرهەمێکی تر پتر بەرگەی کۆسپی ئەم گەردوونە ئەگرن!.

**جەلال تەقی**

سلێمانی- نیسانی ١٩٨٠

# ڕاوی گردی ڕەش

هەبوو، نەبوو کەس لەخوا گەورەتر نەبوو، کەس لەبەندەی خراپ ڕووڕەشتر نەبوو، پادشایەك هەبوو سێ کوڕی هەبوو: ئەحمەدو محەمەدو مەحمود. پادشا تەمەنێکی درێژی بەسەر بردبو کەڕۆژی نزیك بووەوە کوڕەکانی لەدیوەخان کۆبکردەوەو پێی وتن:

(( کوڕەکانم لەدنیادا داوای هیچم لێ نەکردوون، کەئێستا ژیانم تەواو بووەو ئەمرم وەسێتێکم هەیە بەجێی بهێنن، سێ داواکاریم هەیە مەیخەنە پشت گوێ. یەکەم، کەمردم سێ شەو لەسەریەك وەرنە سەرگۆڕەکەم، بزانن چی ئەبینن)).

کوڕە گەورەکەی‌و ناوەنجیەکەی نەیانهێشت قسەکەی تەواوبکات‌وپێیان بڕی‌و ووتیان: ((بابەگیان، خوالەتەمەنی ئێمە هەلگرێ‌و بیخاتە سەر تەمەنی تۆ.. خوانەخواستە ئەگەر شتێکت لێ هات نەك سێ شەو، هەتا مردن سەر گۆڕەکەت جێگامان ئەبێ)).

پاشا ووتی: ((نەء تەنها سێ شەوتان داوا لێ ئەکەم)). دووهەم داواکاریم، کوڕەکانم، وەسێت بێ هەرگیز نەچن بۆ ڕاوی ((گردی ڕەش)). کوڕەکانی بەڵێنیان پێدا، پاش ئەمە زۆری پێ نەچوو گیانی سپاردو بوو بەقوربانی

ئێـوە. پـاش ناشـتن‌و گەڕانـەوە لەگۆڕسـتان, نزیكـی ئێـوارە ئەحمـەد, كەكوڕەبچووك بوو, داوای لەبراكانی كرد شەوێ بچنە سەرگۆڕی باوكیان‌و ڕاسپاردەكەی بەجێ بهێنن, بـەڵام گوێیـان لێ نـەگرت‌و لێشی تووڕەبوون‌و پێیـان ووت: ((بڕۆلـە (۰۰۰۰۰ )بـاوكم بـەین, باوكمـان خەڵـەفابوو ئـەگینا وەسێتی واچۆنەكات!)).

ئەحمەد ووتی: ((باشەخۆم ئەچم)) بەدڵ شكاوی‌یەوە لێ یان دووركەوتـەوە, سـواری ئەسـپ بـوو, و توولـەو تـانجی دوای خـۆی خسـت‌و بـەرەو گۆڕسـتان ڕۆیشت. لـەنزیك كێلـی لای سـەری گۆڕەكـەی باوكیـەوە چاڵێكی بـۆ خـۆی‌و ئەسـپ‌و توولـەوتانجی هەڵكەنـدو چـاوەڕێ ی كـرد بزانـێ چـی ڕووئـەدات. زۆری پێ نەچوو گوێی لەگرمەو ناڵەو بۆڵەبۆڵێك بـوو هـەموو ئـەو نـاوەی لەرزان. لەدوورەوە دێوێكی ڕەشـی قـەترانیی بینـی بـەرەو گۆڕەكـەی بـاوكی ئەهات‌و ئەینەڕاند.

(( دایكـت۰۰۰۰ پاشـا, باوكـت۰۰۰۰ پاشـا, مـن لـەژێر ئـەرز بـۆت ئەگـەڕام تۆلەسەر ئەرز دەستم كەوتووی۰۰ هەرئێستا ئێسك‌و پروسكت بەسـەریەكدا ووردوخاش ئەكەم‌و تۆڵەی چەند ساڵەت لێ ئەكەمەوە)).

ئەمـەی ووت‌و نـەوی لـەكێلی لای قاچـی دەری هێنـێ, ئەحمـەد نـەیكردە نامەردی بۆی ڕاست بووەوە, نـاوی خـوای لێ هێنـاو شمشێرێكی دا لەتـەوقی سەری هەتا ناو لنگی شەقی كرد. بەچەقۆیەك لووت‌و گوێی كـردو خستیە دەسـە سڕێكەوەو لێ ی دا ڕۆیشتەوە ماڵـەوەو بـێ ئـەوەی لای كـەس باسـی بكـات نووسـت. ئێـوارەی دوهـەم چـووەلای براكـانی پـێی ووتـن: ((براكـانم, دوێنـێ شـەو وەسـێتەكەی باوكمتـان بـەجێ نـەهێنا دەبـا ئـەم شـەو بچـین بزانین چی ڕووئەدات, نەك باوكم دوژمندار بووبێ‌و ئابڕوومان بەرن!)).

هەریەکەیان لێ ی ڕاست بوونـەوەو ووتیـان: ((لاچۆلە (٠٠٠ ) دایکـی بـاوکم بەرین, ئەگەر نەخلەفایـە داوای شـتی وای چۆن ئـەکرد, دوێنـێش هـەروات ووت, تۆ چوویت چیت بینی؟))٠٠

ئەحمەد ووتی: (( ناچارم ئەمشەویش هەرخۆم بچم)). بەناچاری دووبـارە خـۆی چـووەوە بـۆ گۆڕسـتانو لەنیوەشـەودا دێـوێکی بـۆر پەیـدابوو هـەر لەدوورەوە ئەینەڕاندو ئـەیووت: ((دایکـت(٠٠٠٠) پاشـا, باوکـت(٠٠٠٠) پاشـا, لەگۆڕیشـدا هـەر زەفـەرمان پـێ ئەبـەیت, دوێنـێ شـەو برایەکـەم هاتـەلات لەناوت بردو نەهاتـەوە, هـەر ئێستا ئێسكو پروسـکت بەسـەر یەکـدا وورد ئەکەمو تۆڵەی براکەمت لێ ئەسەنمەوە!)).

ئەمەی ووتو ئەوی لەکێلی لای قاچی گۆڕی پاشا, لەبن دەری هێناو تـووڕی هەڵدا کـردی بەهـەزار پارچـەوە. ئـەوی لـەکێلی ژوورسـەری ئـەویش لـەبن دەربهێنێ, ئەحمەد لەچاڵەکە هاتەدەرێ, ناوی خوای لێ هێناو شمشێرێکی دا لەتـەوقی سـەری کـردی بـەدوو کەرتـەوە. لـووتو گـوێی ئەویشـی بـڕیو خستیە دەستەسڕێکەوەو چووەوە ماڵەوەو لێ ی نوست.

ئێـوارەی دوهـەم چـوەلای براکـانیو پـێ ی ووتـن: (براکـانم، دوێنـێ شـەو وەسیەتەکەی باوکمان بەجێ نەهێنا دەبا ئـەم شـەو بچین بـزانین چـی ڕوو ئەدات، نەك باوکمان دوژمندار بووبێو ئابڕوومان بەرن!)).

هەریەکـەیان لێ ی ڕاسـت بوونــەوەو وتیــان:(لاچـۆلە(٠٠٠ )دایکـی بــاوکم بەرین,ئەگـەر نەخەڵەفایـەداوای شـتی وای چـۆن ئـەکرد, دوێنـێش هـەروات ووت، تۆچویت چیت بینی؟))٠٠

ئەحمەد ووتی: ( ناچارم ئەم شەو یش هەرخۆم بچم)٠ بەناچـاری دووبـارە خۆی چووەوە بۆگۆڕستانو خـۆیو ئەسپو توولـەو تانجیـەکانی لەچاڵەکەدا

خۆیان شاردەوە . لەنیوە شەودا دێوێکی بۆر پەیدابوو هەرلەدوورەوە ئەی نەڕاندو ئەی ووت : ((دایکت (٠٠٠٠ ) پاشا، باوکت(٠٠٠٠ ) پاشا ، لەگۆڕیشدا هەر زەفەرمان پێ ئەبەیت، دوێنێ شەو برایەکم هاتەلات لەناوت بردوو نەهاتەوە، هەروێستا ئێسکت‌و پروسکت بەسەر یەکدا ورد ئەکەم‌و تۆڵەی براکەمت لێ ئەسەنمەوە !))٠

ئەمەی ووت‌و ئەوی لەکێلی لای‌قاچی گۆڕی پاشا، لەبن دەری هێناو تووڕی هەڵدا کردی بەهەزار پارچەوە٠ ئەوی لەکێلی ژوورسەری ئەویش لەبن دەربهێنێ، ئەحمەد لەچاڵەکە هاتەدەرێ، ناوی خوای لێهێناو شمشێرێکی دا لەتەوقی سەری کردی بەدوو کەرتەوە. لووت‌و گوێی ئەویشی بڕی‌و خستیە دەستەسرێکەوەو چووەوە ماڵەوەو لێ ی نوست. ڕۆژی سێهەم چووەلای براکانی‌و پێی ووتن: ((براینە، وادووشەوە باوکم لەگۆڕدایە باهیچ نەبێ ئەمشەو وەسیەتەکەی بەجێ بهێنین، باوکم دیارە دوژمندار بوە بۆیە ئەو وەسیەتەی بۆکردووین، بافریا بکەوین نەك گۆڕەکەی تێك بدەن‌و ئابڕوومان بچێت )). محەمەدو مەحمود گوێ یان لێ نەگرت‌و ناچار ئەحمەد وەك شەوانی پێشو بەتەنهاچوە سەرگۆڕی باوکی‌و خۆی شاردەوە. لەنیوە شەودا دێوێکی سپی پەیدابوو، پەنابەخوا دێوچ دێو، چاوی ئاگری لێ ئەباری‌و لەدوورەوە ئەی نەڕاند: (( دایکت... پاشا, باوکت .... پاشا لەژێر ئەرزیشدا هەر زەفەرمان پێ ئەبەیت‌و دووبرات کوشتین، مەرج بێ هەرئێستا بتکەم بەپەندی دنیا !)).

ئەمەی وت‌و ئەوی لەکێلێکی تووڕی هەڵدا هەپرون بەهەپرونی کرد، ئەوی لەکێلەکەی تری تووڕی هەڵدا کردی بەخۆڵ،ئەوی لەگۆڕەکەی بەونیازەی ئێسك‌و پروسکی دەربهێنێ، ئەحمەد نەیکردە نامەردی، شمشێرەکەی

هەڵکێشا، ناوی خوای لێ هێنا دای لەتەوقی سەری دووفاشی کرد. بەهەمان شێوە لوتو گوێی ئەویشی کردو خستیە دەستەسڕەکەیەوەو ڕۆیشتەوە.

شەوی دوایی دیوەخان گەرم بوو, مەحمود لەسەرتەختی پادشایی باوکی دانیشتبوو, و پیاو ماقوڵان دەوریان لێ دابوو.

ئەحمەد خۆی کرد بەژورداو پاش کەمێك دانیشتن پێ ی وتن: ((برایىنە, چۆن توانیتان بەقسەی باوکم نەکەنو وەسیەتەکەی بەجێ نەهێنن, مەرجی باوكو فرزەندی وائەبێ؟ )).

مەحمود پاشا لێ ی ڕاست بوەوە پێ ی ووت:

_((تۆش خەڵەفاویت,ئەگینا ئەمە سێ شەوە ئەچیت چیت دیوە؟)).

کەگوێی لەمەبوو هەستایەسەرپێ, یەکی تفێکی کردە ناوچەوانیانودەسەسڕەکەی کردەوە لەبەردەمی دانانوپێ ی ووتن:

_(( ئائەمانەم دیوە .....)).

کەبراکانی ئەمەیان بینیو زانیان ئەحمەد پاڵەوانیەکی نواندوە تك تك نارەقی شەرمەزاریان ڕشتو ئیتر نەیان توانی لەدیوەخان بمێننەوەو هاتنە دەرەوە. بۆبەیانی فەرمانیان دا ئەسپو تولەو تانجیان بۆئامادەبکەن .

کە ئەحمەد لێ یپرسین بۆکوێ ئەچن وتیان:

_بەبێ ئەقڵی خۆمان ئەو پاڵەوانیەتیەمان لەدەست خۆمان داودێوەکان تۆکوشتتن, ئێستا ئێمە ئەچین بۆڕاوی

((گردی ڕەش )), بەڵکو ئێمەش لەوێ پاڵەوانەتیەك بنوێنینوئەم شەرمەی خۆمان بسرینەوە,دیارە ئەوێ شوێنێکی پڕ مەترسیە بۆیە باوکمان وتی مەچن )).

ئەحمەد کەوتە پاڕانەوەو پێ ی وتن:

_(( براییـنــه بیکــەن بۆخــاتری خــوا, ئامۆژگــاری پێشــووی باوکمانتــان نەگرتەگوێ ئەنجامەکەتان بینی, ئـەم داواکاریەشـی ڕەت مەکەنەوەومەچـن بۆڕاوی گردی ڕەش نەك خوانەخواستە توشی بەڵایەك بن....)).

ئەحمـەد زۆری ووتو ئـەوان کـەمیان بیستوبۆ ڕۆژی دوایـی کەوتنـە ڕێ, ئەحمەدیش ئاگری جگەر هەڵی گرتو شوێنیان کەوت.

ڕۆیشـتن...ڕۆیشـتن... کـەئێوارەیان لێ هـات گەیشـتنە ئاشـە کۆنێـك. لـەوێ محەمــەدو مــەحمود باریــان خســت, هەرچــەندە ئەحمــەد تکــای لێ کــردن لەئامۆژگاریەکـەی باوکیـان دەرنەچـنو لـەم ئاشــە کۆنــەدا ڕۆژ نەکەنــەوە بــەگوێیان نەکردوئــەوان نوســتن, بــەڵام ئەحمــەد نەنوســت, ئێشــکی گــرت. لــەنیوە شــەودا مــەحمود خەبــەری بــوەوە گــوێ ی لێ بــوو ئەحمــەد شــیر ئەســوێتەوەو تیــژی ئەکاتــەوە. محەمــەدی خەبــەرکردەوە پــێ ی ووت (( هەستە محەمەد, ئەحمەد شیرمان بۆ ئەسوێتەوەئەترسم سەرمان ببڕێ!)).

محەمـەد پـێ ی ووت: ((کاکـە, بنـوو بـێ خـەم, ئەحمـەد کـاری وانـاڕەوای لێ ناوەشێتەوە.))ونوستەوە.

لەنیوە شەودا ئەحمەد بینـی ئاگرێـك بـەردو ئاشـەکۆنەکە هـات... کـەنزیك بوەوە چی بینی! دێوێك وەك کورەئاگر لەدەمی ئەهاتـە دەرەوە بـەرەو ڕوی ئاشەکە ئەهات , هەر لەدوورەوە هاواری کرد((بۆن دێ... بـۆنی بێگانـان دێ ...لەو عەردوو مەکانان دێ ... کێ زاتی کردوە بێتە لانەکەمەوەو لێم پیس بکات, باڵداربێ باڵی ئەشکێنم... ناڵداربێ ناڵی ئەشکێنم!)).

کە ئەحمەدی بەدی کـرد پـەنا بـەخوا ئەوەنـدەی تـر غـەزەب گرتـی, پـێ ی ووت:

((ئەودتۆی بەد فەساڵ!.. باوکی گۆڕ بەگۆڕت لەگۆڕەکەشیدا هەر پێمان ئەوێرێ ؟ سێ ئامۆزای کوشتوم؟ تۆڵەی ئەوانیش ئێستا لەتۆ ئەکەمەوە, خۆت بگرە هاتم!...)).

ئەمەی وتو وەك واشە بەرەو ڕووی هات. ئەحمەد خۆی لەبەر لادا, بۆی وەرگەڕایەوەو ناوی‌خوای لێ هێناو. شیرێکی لێداو کردی بەدووکەرتەوەوڵێ ی نوست.

کەبەیانی براکانی هەستان و لاکی دێوەکەیان بینی بەجارێك شەرمەزار بوون‌و پێ یان ووت: (( وادیارە هەتا تۆمان لەگەڵ بێت هیچ پاڵەوانەتیەك بۆ ئێمەنابێ, ئەبێ بگەڕێیتەوە ماڵەوە لێمان دوور بکەویتەوە.., خۆمان ئەڕۆین)).

ئەحمەد هەرچەندە هەوڵی داوپاڕایەوە ڕایان نەگرت‌وناچار بەرەو ماڵ گەڕایەوە.

بۆ ڕۆژی دوایی محەمەدو مەحمود ڕێگایان گرتەبەر بەرەو ((گردی ڕەش)). زۆر ڕۆریشتن....کەم ڕۆیشتن, ئەوە هەر خوا ئەیزانێ ...کەلێ ی نزیك بوونەوە چی ببینن! پڕ لەباغ‌و باخات‌و کانی ڕون‌و پڕ لە دارستان , هەر بۆ ئەوە ئەشیا شازادەی تێدابژی .

مەحمود بەمحەمەدە ووت ((دەتۆ بڕوانە, باوکم ئەیویستوە ئێمەشوێنی واخۆش ببینین بۆیە وەسیەتی کرد ئەیەین بۆ ئێرە , ئەگینا شوێنی لەمەخۆشتر لەکوێ دەست ئەکەوێ!)).

محەمەد ووتی : بەخواکاکە دڵم باش ناهێنێ ... هەتا ئێستا هەردوو وەسیەتەکەی پێشووی ڕاست دەرچوون,بۆ ئەمەش دڵم کرمێ بوە!... ئەڵێم بگەڕێینەوە باشترە!..)).

مەحمود خەریك بوو قسەبكات ئاسكێكی هێندە جوان لەبەردێكەوە دەرپەڕی قسەی لەبیر بردەوەو دوای كەوتن, هالێرە.

هالەوێ هەتا گەیشتە بەردەم ئەشكەوتێك.. ئاسكەكە خۆی پێدا كردوو ئەوانیش بەدوایدا... كەچوونەژورێ ئاسك دیار نەبوو, هەرچەندە ناو ئەشكەوتەكە گەڕان نەیان دۆزیەوە... لەلایەكی ناوەوەی ئەشكەوتەكەدا مێزێكی ڕازاوەیان بەدی كرد هەرخواردنێك دڵ پێ ی خۆش بێت لەسەری بوو. چونكە برسیان بوو دانیشتن و دەستیان كرد بەنان خواردن, كەتێریان خوارد هەستان دەستیان بشۆن ئاسكەكەیان بەدی كردەوە, ڕاویان نا خۆی كرد بەژورێكی گەورەدا , كەچوونەئەو ژوورەوە لەباتی ئاسكەكە دڕندەیەكی سەیریان بینی... هەردووكیان گرت و بردنیە ژوورێكەوە... سەرەو خوار بەسنگێكی بنمیچەكەوە هەڵواسین و دەرگاكەی لەسەر داخستن و بەجێ ی هێشتن.

بامحەمەدو مەحمود بەهەڵواسراوی جێ بهێڵین و بزانین لەماڵوە چ باسە.

كەدایكیان بینی كوڕەكانی دیارنین هانای بردە بەر ئەحمەدو پێ ی ووت:

_((ڕۆڵە شیرینەكەم , ئەوە ماوەیەكی دوورو درێژە ئەو برایانەت بێ سەرو شوێن ڕۆیشتوون بۆچی بەزەییەكت پێما نایەتەوە ناچی بۆ سۆراغیان؟))

ئەحمەد ووتی ((دایە گیان, هەرچەندە هەقیش نیە بچم بەدوایاندا بەڵام لەبەر خاتری تۆ بەیانی ئەڕۆم, یان ئەیان هێنمەوە یان سەری خۆم دائەنێم)).

بۆ بەیانی خۆی كۆكردەوە, دەسەسڕێكی دابە دایكی وپێ ی ووت: ((دایە گیان,با ئەم دەسەسڕەت لابێ, هەتا وەك خۆی مابێ ئەوە منیش ماوم,

ئەگەر کون کون بوو ئەوە مەعنای وایە مردووم!)) دۆعا خوازی لەدایکی کردو کەوتە رێ.

باسەرتان زۆر نەیەشێنم ولەکورتی بیبڕمەوە, ئەحمەد کەگەیشتە گردی رەش بەهەمان شێوە ئاسکەکەی بەدی کردو دووی کەوت هەتا کردی بەنەشــــکەوتەکەدا... بــــەلاّم ئـــــەم نەچـــــوە ژوورەوە لەبــــــەردەم ئەشکەوتەکەداخۆی مالت داو چاوەڕێی کرد... کەئاسکەکە زانی ئەحمەد نەهاتە ژوورەوە پاش کەمێك سەری دەرهێنا کەبزانێ چی لێهاتوە, ئەویش ناوی خوای لێ هێناو شیرێکی دا لەملی و سەری پەڕاند. هەرکە سەرەکە کەوتەسەر زەوی بووبەگرمەگرم و تەپو تۆزێك چاو چاوی نە ئەدی. پاش ماودیەك کەتەپو تۆزەکە ڕەویەوە ئەحمەد خۆی کرد بە ئەشکەوتەکەدا. کــــەگوێ ی لەنالّــــەنالّی براکــــانی بــــوو, بەهەلّــــە داوان ئــــەو ژوورەی دۆریەودوکردنیەوە, باوەشیان کرد بەیەکداو هاتنە دەرەوە, بەلاّم دوبارە گوێ یان لەنالّەنالّ بوو, کەگەڕان چەند ژوورێکی تریان دۆزیەوە,بینیان هەرپیاوەسەردەو خوارو هەرژنە بەپرچ هەلّواسراون...

هــەموویان کردەوەودایــان گــرتن, ئــەوەی مردبــوون ناشــتیانن وئەوەی مابوولەگەلّ خۆیان بردیانن,سێ کچی زۆر جوانیان تێدابووبەرەو مالّ گەڕانەوە. ئەحمەدە محەمەدو مەحمودلەخۆیان مارەکردن.

پاش ماوەیەك خوشکێکی ئاسکەکە هاتەوە, کەبینی براکەی کوژراوە_ چونکە ئاسکەکە برای بووو, چووبووە کلێشەی ئاسکەکەوە_ دەستی کرد بەگریان و قژڕنینەوەو لەدلّی خۆی دا ووتی: ((ئای... هەبێت و نەبێت ئەمە کاری کوڕانی پادشان, هەر ئەوانن بتوانن زەفەرمان پێ بەرن,

ودووبراو سێ ئامۆزام بکوژن، مەرج بێ بەرەچەڵەکیاندابچمە خوارەوەو ڕیشەتان لەبن دەربهێنم٠٠٠ )).

ئەمەی ووت خۆی خستە شێوەی پیرێژنێکی سەدساڵەوەو سواری چەرخوفەلەکەکەی بوو و، بەرز بووەوە گەیشتە ئەو شارەی ئەحمەدو محمەدو مەحمودی لێ بوو. لەقەراغ شارچەرخو فەلەکەکەی لەژێر دەوەنێک دا شاردەوەو بەرەوشار ڕۆیشت٠٠٠ گەڕا، گەڕا، هەتا ماڵی پاشای دۆزییەوەو لەدەرگای دا. ژنی پادشا دەرگاکەی لێ کردەوەو بانگی کردە ژوورەوە٠٠٠ ماوەیەکی زۆرمایەوە هەموو ئیشێکی ئەکردو خۆی لایان خۆشەویست ئەکردو دڵی لێ ئەسەندن، هەتا ڕۆژێک ژنەکانی ئەحمەدو محەمەدو مەحمودی قایل کرد پێکەوە بچن بۆسەیران. بەفێڵ بردنیە ئەو شوێنەی چەرخو فەلەکەکەی لێ شاردبووەوە، ووتی: (( ئای کچینە ئەم شتە چی یە؟ وەرن تەماشاکەن! )) کەهاتنە پێشەوە لەخشتەی بردنو هەموویان پێکەوە چوونە ناوی دانیشتن. پیرێژن دەستی برد بۆ دەسکەکەی و ووتی(( ئای خۆئەم شتە با ئەخوات، ئابزانم ئەمە چیە!)) ئەمەی ووت و دەسکەکەی باداوچەرخو فەلەکەکەی خستە گەڕو بەرزی کردەوە٠٠٠ هەرچەندە ژنەکان هاواریان کردو قیژاندیان کەدایان بەزێنێ کەڵکی نەگرت هەتا (( گردی ڕەش))، لەوێ دایبەزاندنو بردنیە ئەشکەوتەکەو گەڕایەوە ماڵی پادشا. کەلێ یان پرسی کوا ژنەکان ووتی: (( داپیرە بەقوربانتان بێ ئەوان لەپێش مندا هاتنەوە)).

کە ئەحمەد هاتەوەو هەواڵی ون بوونی ژنەکانی بیست زانی مەسەلە چیەو دڵی لەو پیرەژنە کرمێ کرد. بەدایکی ووت کە تەندوور دابخاتو کولێرە بەرۆنی بۆبکات چونکە ئەچێ بۆگەشتو گوزار. لەوەتەی پیرێژنەکە

هاتبوو بۆماڵی پادشا نان پێوەدان بەو سپێررابوو··· تەندوورەکە ئەوەندە سوور بوو بووەوە جۆشی سەندبوو, کەنانەکەی دا بەتەندوورەکەوە ئەحمەد لەپشتەوە ناوی خوای لێهێنا پاڵێکی پێوەنا خستیە تەندوورەکەوە··· هەر کەبەر ئاگرەکە کەوت نەعرەتەیەکی کێشا دنیا شێواو تاریک بوو, و لەوەوپاش دامرکایەوە.

ئەحمەد سواری ئەسپەکەی بوو, و بەرەو گردی ڕەش کەوتە ڕێ کە گەیشتە ئەشکەوتەکە چوە ژوورەوەو ژنەکانی دۆزییەوە. وەك جاری پێشوو هەڵواسرابوون, کردنیەوەو ئەشکەوتەکەی وێران کردو هێنانیەوە ماڵێ··· هەموو بەیەك شادو شوکر بوونەوە···

**منیش هاتمەوە هیچیان نەدامێ.**

# (( زەنگی شەقلە باز ))

هەبوو... نەبوو... کەس لەخوا گەورەتر نەبوو, کەس لەبەندەی خراپ ڕوورەشترنەبوو پادشایەك هەبوو, ڕۆژێك لەگەڵ براکانیو گەورە پیاوانی شاردا بەکۆلانێکدا ئەڕۆیشتن. لەبەر پەنجەرەی باڵەخانەیەکدا سێ خوشك دانیشتبوون پادشا گوێی لێ یان بوو قسەیان ئەکرد. خوشکی گەورە ووتی:

(( ئاخ, خۆزگە براگەورەی پادشا بیخواستمایە بەهێلکەیەك حەوت دەستە میوانم بۆ بەڕێ بکردایە!)).

خوشکی ناوەنجی ووتی:

(( خۆزگە براناوەنجی پادشا بیخواستمایە لەخوری یەك فەرشی حەوت ژوورم بۆ دروست بکردایە!)).

خوشکی بچووك ووتی:

(( بەخوا من ئەمانەم هیچ پێ ناگرێ, بەلام خۆزگە پادشا خۆی بیخواستمایە کوڕێکی کاکۆڵ زێڕینو کچێکی دان گەوهەرینم بۆ بدیایە!...)).

پادشا کەگوێی لەمەبوو فەرمانی دا شاییو لۆغانیان سازکرد کچی گەورەی لەبرا گەورەکەیو کچی ناوەنجی لەبرا ناوەنجیو کچی بچووکی لەخۆی مارەکرد.

پاش ماوەیەك براگەورەی پاشا ویستی ژنەکەی تاقی بکاتەوە, چەند هاورێ یەکی خۆی دەعوەت کردو بەژنەکەی ووت: (( ئابزانم چۆن قسەکەت دێنیتە دی, ئەوە حەوت هێلکەو تۆ یەك میوانم بۆ بەرێ بکە)). ژنەکە وەڵامی دایەوە: ((حەو, من شتی وام چۆن پێ ئەکرێ, ئەوسا بەگاڵتە وام ووت)).

خوشکی گەورەیان تەڵاق دا.

پاش ماوەیەکی تر برا ناوەنجیی بەخوشکی ناوەنجی ووت: ((تۆ ووتت لەخوری یەك فەرشی حەوت ژوور دروست ئەکەیت, هانەوە حەوت خوریو فەرشێکم بۆ دروست بکە)). ژنەکەی وەڵامی دایەوە:

((ئەیرۆ ئەمە لەوزەی کێداهەیە, بیانووم بۆچی پێ ئەگری !)).

ئەویش تەڵاق درا.

مایەوە خوشکی بچووك .

ئەوەندەی پێ نەچوو سکی پڕ بوو, ووردە ووردە بەرز بۆوەوە. خوشکە کانی بانگ کردە لای خۆی کەیارمەتی بدەنو ئاگایان لێ ی بێ. خوشکەکانی ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر ڕقیان لێ ی هەڵئەستاوبەغیلی یان پێ ئەبردکەبۆچی ئەوان تەڵاق دراونو ئەو واخەریکە ئاواتی دێتە دی.

باسەرتان نەیەشێنم, نۆمانگو نۆڕۆژونۆسەعاتونۆدەقیقە تێپەڕیو زا.. گرتی. خوشکەکانی پێ یان ووت:

_((خوشکێ گیان ئەبێ بچیتە سەربانو لەکلاوڕۆژنەکەوە منداڵەکەت بخەیتە خوارەوەو ئێمە لێرە جاجمی بۆ ئەگرینەوە)) هەرچەنددهاو.. کردو پاڕایەوە وتیان نەبووەو نابێو هەر ئەبێ وابکەی, نەریت .. ئەگینا منداڵەکەت نابێوئابڕوشمان ئەچێ.

بەچنگە کرێ ناردیانە سەربانو خۆیان لەژێرەوە چاوەڕێ یان کرد. زۆری پێ نەچوو خوا کچو کوڕێکی دایەو لەکلاورۆژنەکەوە خستنیە خوارەوە. خوشکەکانی جاجمێکیان بۆگرتبۆوە کەوتنە ناوی، بەلام یەکسەر خستیانە سندوقێکی دارینەی بەقیر داپۆشراوەوەو ناردیان دایان بەدەم ئاوی ڕوبارێکەوە. ئەو ڕۆژەش سەگێکی مالی پادشا ترەکی بوو پێنج شەش توتکی بوو بوو، دووتوتکیان خستە جاجمەکەوەو دایان نا. کەژنەکە هاتە خوارێو داوای مندالەکانی کرد جاجمەکەیان بۆکردەوەو تووتکەکانیان پیشانداو پێ یان ووت: (( دەك باوانت شێوێ، ئەمە بوو ئەو کوڕە کاکۆل زێڕینەو کچە دان گەوهەرینەی بەتەمایان بووی؟)).

ژنەکە دەستێکی کەوتە ئەم لاو دەستێکی کەوتە ئەولاو بەکەساسی یەوە ووتی:

_ ((وانیە، بەلام باوابێ)).

خەبەریان نارد بۆ پادشا کە ئەو ڕۆژە نەچووبوو بۆ ڕاوو شکارو چاوەڕێی ئەوەبوو ژنەکەی مندالی ببێو پێ یان ووت:

((پادشامان مژدەمان بدەرێ، ژنەکەت دوو تووتکی نەرمو نۆلی بووە!)).

پاشا ئاگری تێبەر بووو، قیڕاندی: ((بڕۆن لەگەل تووتکەکان دا بیانخەنە ژوورێکەوەو هەر ئێسقانو پاشماوەیان دەرخوارد بدەن)).

ژنە بەستە زمانەکەیان لەگەل تووتکەکاندا خستە ژووردکەوەودەرگایان لەسەر داخستو پاسەوانێکیان بەدیارەوە دانا.

بێینەوە سەر باسی دوومندالەکە. کەپووردکانی خستیانە سندوقە دارینە بەقیر داپۆشراوەکەو دایان بەدەم ئاوی ڕووبارەکەوە تەوژمی ئاودکە بردی... بردی... هەتا لەگەرووی ئاشێك توندیکردو بەری ئاوەکەی لێ

گرت ئاشەوانەکە پیرێکی وەلی بوو, هات بزانێ چی گرتوویەتی. کەڕوانی سندوقێك گەرووەکەی گرتووە, دەری هێنا لەدلێ خۆی دا ووتی: ((خوا ناردوویەتی, ئەم سندوقە کەل‌وپەلی تێ ئەخەم)). کەسەرەکەی کردەوە چی ببینێ! کچ‌وکوڕێکی بینی لەگەڵ ڕۆژدا شەڕیان ئەکرد, بەئەمری خوا هەریەکەیان ئەمەندە پەنجە تووتەی خۆیان مژی بوو شیریان تێزابوو و, بوو بوون بەمەمك. ژنەکەی بانگ کردو. ووتی:

_((کچێ وەرە تەماشاکە!٠٠)).

ژنەکەی لەدوورەوە بانگ کردەوە: (( ئەرێ باوانت شێوێ ئەوەچیتە, بۆ هاوار ئەکەیت؟)).

کەهات پیرەمێرد ووتی : ((کچێ ئافرەت چۆن هاوار نەکەم, ئێمە چەند ساڵە پێکەوەین منداڵمان نەبووە ئێستاوا خوا ئەم دوو منداڵەی بۆناردووین٠٠٠ ئیتر چۆن خۆم بگرم‌و هاوارنەکەم)).

بەدڵخۆشی یەوە منداڵەکانیان بردە ئەشکەوتەکەوەو ناویان نان ئەحمەدو فاتێ. ،

سەرتان نەیەشێنم, خۆزمان ماندوونابێت‌و ئەتوانم زۆرتان بۆ بڕێسم!. بەڵام بالەکورتی بیبڕینەوە. منداڵەکان گەوردبوون‌و بەڕاستی وایان ئەزانی کەمنداڵی ئاشەوانەکەن, هەتا ڕۆژێك ئەحمەد لەکۆڵان یاری ئەکرد لەگەل کوڕێکی هاوڕێی دا لێ یان بوو بەهەراو, هاوڕێکەی پێی ووت:

_((دەبڕۆبەولاوە هەتیوەی لەگەرووی ئاش دا دۆزراوە, کەس نازانێ دایك‌و باوکتان کێ یە, ئەگەر باش بوونایە فڕێ نەئەدران!)).

ئەحمەد کەئەمەی گوێ‌لێ بوو تاس بردیەوەو بێ دەنگ پەنجەی گە هاتەوە ماڵێ. ئێوارە کەهەمووپێکەوەدانیشتبوون بەئاشەوانەکەی د٠

(( بابەگیان توخوا ئەگەر بەڕاستی پێم نەڵێ ی دایكو باوکمان کێن. ڕاستە ئێمەت لەگەرووی ئاشدا دۆزیوەتەوە؟)).

ئاشەوانەکە دەستێکی کەوتە ئەملاو دەستێکی کەوتو ئەولاو ناچار بوو ڕاستی یان پێ بڵێ.

بۆسبەینێ ئەحمەد هاتەلای ئاشەوانەکە, دەستی ماچ کردو ووتی(( بابەگیان, تکام لەخزمەتت دا ئەوەیە کەڕێگامان بدەیت بڕۆین بەڵکو دایكو باوکمان بدۆزینەوە)).کە ئاشەوانکە زانی قسە کەڵك ناگرێ ڕێگای دانو بەگریان لەگەڵ پیرێژن دا هەتا قەراغ شار بەڕێ یان کردن. پێش ئەوەی دۆعای خواحافیزی لەیەکتر بکەن بەئەحمەدی ووت:

((ڕۆڵەی شیرینم پێش ئەوەی لەگەڵ یەك جیا ببینەوە دیاریەکت ئەدەمێ. ئەم مێزەرەو ئەم دارعاسایەی دەستم لێ وەرگرە, پارێزگاریان بکە هەتا ئەگەیتە شوێنێکی ئاودار کەبەدڵت بێ, ئەوسا چاو بنووقێننو مێزەرەکە بکەرە سەرتو دارعاساکەبدە بەزەوی داو بڵێ: لەنیەتی ئەوەی بهێتە کۆشكو تەلارێك وێنەی نەبێ. دەبرۆن خواتان لەگەڵ!)).

ئەمەی ووتو بەجێ یان هێشتن .

ئەحمەدو فاتێ هەر ڕۆیشتن... هەرڕۆیشتن... هەتا گەیشتنە دارو دەوەنێك. بینیان گورگێك منداڵێکی بەدەمەوەیە. ئەحمەد تیرێکی تێگرتو کوشتیو منداڵەکەی هەلگرتەوە. ماوەیەکی تر ڕۆیشتن تاگەیشتنە کۆمەڵێك شینو شەپەڕۆیان ئەکرد, لێ یان چوونە پێشەوە بینیان لەئینسان باجنو هەموو کورتە بنەن. لێ ی پرسین: (( ئەوە خێرە واشیوەن ئەکەن؟)).

وتیان: (( ئێمە دەستو پێوەندی شای جنۆکانین, پادشامان هەمووساڵێك کوڕێکی ئەبێت, دوژمنێکی هەیە خۆی ئەخاتە شێوەی گورگێکەوەو ئەیرفێنیو ئەیبات. وائێستا گورگەکەمان هەڵبڕیو لێرددا لێمان وون بوو)).

منداڵەکەی پیشان دانو ووتی: (( ئەمەیە منداڵەکە؟)).

وتیان: (( بەڵێ)).

خەبەریان برد بۆ پادشا کەئادەمیزادێك گورگەکەی کوشتوەو کوڕەکەی ڕزگارکردووە. پادشای جنۆکەکان بەسەری ڕووتیو بەپێ ی پەتی هات بۆلای ئەحمەدو ئەملاو ئەولای ماچ کردو پێی ووت:

_((لەپاداشی ئەمەداچی داوائەکەیت ئەتدەمێ)).

ئەحمەد ووتی ((ئەسپی زمان زانم بدەرێ !)).

شای جنۆکان ئاخێکی هەڵکێشاو ووتی: حەوت ساڵە هەمووساڵێك کوڕێکم ئەبێتو گورگ ئەیبات, خۆزگە حەوت ساڵی تریش کوڕم بوایەو گورگ بیبردایە بەڵام داوای ئەمەت لێ نەکردمایە... بەڵام تازە بڵێم چی, بەڵێنم دایتێ چیت بوێت بتدەمێ .... ئادەی بچن بۆی بهێنن!...

ئەسپێکیان بۆهێنا, ئەسپ چی ئەسپ هەرقابیل بە شانو شەوکەتی خۆی بوو, سواری بوو فاتێ ی خستە پاشکۆی خۆیەوە, لێ یان جیابوونەوەولێیاندا ڕۆیشتن! هەر ڕۆیشتن... هەر ڕۆیشتن...هەتاگەیشتنە بەرزاییەکی سەوزی پڕلەکانیو مێر غوزار, ئەمەندە خۆش بوو دڵی ئەکردەوە... هەتا چاوبڕکا هرباخو باخاتو دارستان بوو, بەکورتی جێگایەکی بێ وێنەبوو.

دابەزین چاوێکیان بەدەوری خۆیاندا گێڕا... ئەحمەد ئەم جێگایەی زۆر بەدڵ بوو, بەفاتێ ی خوشکی ووت:

((خوشکێ گیان, ئەم جێگایەت بەدڵە؟ دۆعابکەین ببێت بەکۆشك؟)).

فاتێ وەرامی دایەوە:

_((ئەی تۆ بەدڵتە )).

_((بەڵێ )).

فاتێ ووتی:

_ ((خوشکت لەدەورت گەڕێ ,تۆ پێت خۆش بێت منیش پێم خۆشە )).

ئەحمەد داوای لێ کرد چاو بنوقێنێ, مێزەرەکەی لەسەرکرد, دارعەساکەی دابەزەوی دا, ووتی:(( خوایە, لەنیەتی ئەوەی ئێرە ببێتە کۆشكو تەلارێك وێنەی نەبێ)).

کەچاویان کردەوەچی ببینن!کۆشکێك کۆشکێکی بێ وێنەلە خەویشدا شتی وەهایان نەدیبوو, هەر واقیان وڕما. کەچوونە ژوردوەنەوەندەی ترحەبەسان, نەیان ئەزانی خۆیان بەکوێدا بکەن , ئەمەندەی زۆر تێدابووتیا وون ئەبوون, هەموو کەلو پەلێکی پێویستیشی تێدابوو.

(()) (())

هەموو بەیانی یەك ئەحمەد ئەچوو بۆ ڕاوو شکارو فاتێ لەماڵەوە ئەمایەوە, کە ئێوارە ئەگەڕایەوە فاتێ بەڕوخۆشی ئەچوو بەپیریەوەو چی ڕاو کردبووڵێ ی وەر ئەگرتو خواردنی دروست ئەکردوبەکامەرانی ژیانیان ئەبردەسەر.

ڕۆژێك پادشای شار لەکاتی ڕاوو شکاردا ئاسکێکی ڕاونا , بەڕێکەوت ئاسکەکە بەرەو بەرزایی نزیك کۆشکەکە ڕۆیشت.

پادشاکە ئەمەی بینی حەبەساو واقی ورِما. بەدەستو پێوەندەکانی ووت: ((ئەمە کۆشکی چ پادشایەکە هاتوە تەختو تاجم لێ بسێنێ؟...)).

وەرامیان دایەوە: پادشامان، کچو کورێکی تێدایەو هیچی تر، کەس نەئەیان بینێو نەقسەلەگەڵ کەس ئەکەن. کورەکە بەیانی ئەرِوات ئێوارە دێتەوەو تەنها کچەکە لەماڵ ئەمێنێتەوە پادشا زیاتر مەراق گرتیو بەدەوری کۆشکەکەدا چەندجارێك سورِایەوە، لەپرِ لەپەنجەرەیەکدا فاتێ ی بەدی کردو یەکسەر بەتیری ئەشقی گرفتاربوو، بەلەرزەوە گەرِایەوە.

ناردی بەشوێن پیاو ماقولاٌنو تەکبیرکەرانیدا کەچارێکی بۆ بدۆزنەوە. هەریەکەی قسەیەکی کرد، یەکێك ووتی: بۆت ئەفرِێنین، یەکێك ووتی کورەکە ئەکوژین، بەلاٌم پادشا ئەمانە رِەت کردەوەو ووتی کەناشێ کاری ناپیاوانەی لێ بوەشێتەوە. لەدواییدا ئارامی لێ هەلگیرا، جارِیاندا پادشا گرفتێکی هەیە کێ بەخۆیدا رِائەپەرموێو ئەتوانێ چاری بکات با بێتە خزمەتی.

هەرکەسێ ئەهات تەگبیری ئەکرد پادشا بەدڵی نەبوو، رِەتی ئەکردەوە. لەدواییدا پیرە ژنێکی پشتکۆمی سەرئاسنینە پەیدابوو، ووتی، (( پادشا، من پێت ناڵێم چی ئەکەم، بەلاٌم ئەنجامی کارەکەم ئەبینیت...))پادشا پێی ووت:

_((داپیرە، چارم بکەیت بەسەنگی خۆت ئاڵتونت ئەدەمێ)).

وەرامی دایەوە: (( ئاڵتونم ناوێ، هەرسەرێك بەلەتكو سەرێك بەپەتك هەڵم کێشە هیچی ترم پێویست نیە....) (مەرج بێ دەجار بەلەتكو دەجار بەپەتك هەڵت کێشم، هەرتۆ فاتێم دەست بخە تەختی پادشاییشم ناوێ!))

پیرێژن رِۆیشت...

خۆی گەیاندە بەردەرگای كۆشكی ئەحمەدو لەدەرگای دا فاتێ لەپەنجەرەی سەردەرگاكەوە سەیری كرد بەڵام دەرگای لێ نەكردەوە, هەرچەندە پیرێژن پاڕایەوە نەیهێشت بچێتە ژوورەوە. ناچار لەبەر دەرگاكە هەڵتروشكاو چاوەڕێی كرد كاكی بێتەوە.

ئێوارە كە ئەحمەد هاتەوە پیرێژنی لەبەر دەرگا بەو كەساسیەوە بینی بەزەیی پێداهاتەوەو پێی ووت: (( داپیرە ئەوە چی ئەكەی لێرە؟)).

وەڵامی دایەوە ((داپیرە لەدەورت گەڕێ, لەخێڵ بەجێ ماووم و ڕێگەم لێ وون بوە, داڵدەم بدەن هەتا خێڵ ئەگەڕێتەوەو لەگەڵیاندا مل ئەشكێنم...)).

ئەمەندە كڕوزایەوە دڵی نەرم كردو تكای لەفاتێ كرد كەبیباتە ژورەوەو پێشی ووت:

_((خوشكێ گیان, هەرهیچ نەبێ بۆهاودەنگی باشە , تۆبەم ڕۆژگارە دوورو درێژەبەتەنیایت. باهیچ نەبێ بائەم داپیرەیەت لابێت...)).

ئەمەندەی بۆ ووت فاتێ قایل بوو , بردیە ژورەوە.

پیرێژن ئەمەندەبەدەورو پشتی فاتێ دا ئەهاتو ئیشی بۆئەكرد دڵی لێسەندو وای لێكرد بەدایكێكی دڵسۆزی تەماشا بكات.

ڕۆژێك ئەحمەد چووبوو بۆ ڕاوو شكار داپیرە ووتی:

((ئەرێ داپیرە لەدەورت گەڕێ , تۆ بەم جوانی یە, كاكت بەو جوانیە چۆن وابەتەنیا ئەژین؟ حەیف نیە زەنگی شەقلەبازتان نەبێ ؟...)).

فاتێ ووتی :

_(( داپیرە گیان زەنگی شەقلە باز چیە؟)).

ووتی (( ئەیەڕۆ نازانی؟ شتێكە لەهەزار ئاواز ئەخوێنێ....

ئەوەتان لابێ هەرگیز تاقەتتان ناچێ )).

_ بەقوربان , بەکاکت بڵێ بچێ بیدۆزێتەوەو بیهێنێ.

کەئێوارە هاتەوە وەك ڕۆژان مەچۆ بەپیریەوەو قسە مەکەو خۆت پەست پیشان بدە, کەووتی چیتە بڵێ زەنگی شەقلەبازم ئەوێ , لەبەر ئەوەی زۆری خۆش ئەوێی دڵت ناشکێنێو بۆت پەیدا ئەکات.

کەئێوارە ئەحمەد گەڕایەوە فاتێ وەك جاران نەچوو بەپیریەوەو بەخێر هاتنەوەی نەکردو تفاقی ڕاوی لێ وەرنەگرت

ئەحمەد سەری سوڕماو ووتی:

_((خوشکێ گیان ئەوە چ خێرە؟ خۆ شکور نەخۆش نیت, چی ڕوی داوە پێم بڵێ )).

_(( نەء کاکە نەخۆش نیم... بەڵام خۆت ئەیزانی بەم ڕۆژگارە تۆ لەدەرەوەی و من بەتەنهام... خۆ ئەم پیرێژنەش هەتاسەر بۆمن نامێنێ , ئەبێ چارێکم بکەی )).

_(( باشە چی بکەم ؟ چۆن چارت بکەم؟)).

_(( زەنگی شەقلە بازم بۆبێنە )).

ئەحمەد تاس بردیەوە, بەڵام ووتی (( تۆ ئەم شەو بنوو, هەتا سبەینێ خواکەریمە )). ئەو شەوە نوستن ... بۆ بەیانی ئەحمەدکاڵەو پێتاوی ئاسنی لەپێ کردو کەڵو پەلی پێویستو توێشوی ڕێگای هەڵ گرتو سواری ئەسپی زمان زان بوو,

دۆعا خوازی لە فاتێو داپیرە کردو لێ یدا ڕۆیشت.

هەر ڕۆیشت.... هەر رۆیشت ... هەتا گەیشتە سەر کانیو ئاوێکو, دانیشت بحەسێتەوە. ئەمەندەی پێ نەچووپیرە مێردێکی ڕیش سپی نورانی لێ پەیدابوو. سلاوی لێ کردو لایەوە دانیشتو ووتی:

_ (( ها ئەحمەد, ئەوە ئۆغر بێ؟)).

وەرامی دایەوە ( (کە ئەزانی ناوم ئەحمەدە ئەبێ بشزانی بۆ کوێ ئەچم .))

ووتی (( ئەحمەد, ئەوەندە بە قسەی فاتێ ی خوشکت بکەیت سەرت تیا نەچێ... بەلام قەیناکات لەبەر ئەوەی جوانکەی یارمەتیت ئەدەم... ئەو شتەی بۆی ئەچیت هەتا بلێ ی پڕ مەترسی یە... ماوەیەك ئەڕۆیت ئەگەیتە دڕكو داڵێك هەموو بەرورگو پەراسوی ئەسپەکەت ئەکات بەخوێن , کەمێك بوەستەو بلێ:|(دەك ئاوابێ باخو باخاتەکە, لەباخو باخاتەکەی مالی باوکم خۆشتری ..), ئەختێکی تر ئەڕۆیت ئەگەیتە کانیەکی بۆگەن لەدوورەوە دلت خەریك ئەبێ بێتە دەرێ, ئەکەی ڕوت گرژ بکەیتو لوتت بگری ,دابەزەو بەزەردە خەنەوە دەستو دەمو چاوی لێ بشۆو بلێ:( دەك ئاوابێ کانی یە شەکراوەکە ئەلێ ی کانی بەهەشتی ). ها, ئەم پنتکە سابونەشت ئەدەمێ, لەگەڕانەوەتدا ئەگەر دوات کەوتن بۆیان فڕێ دە....ئامۆژگاریەکی تریشت بکەم, کەئەگەیتە زەنگی شەقلەباز ئەبینی دەلە دێوێك لەلایەوە پال کەوتوە پاسی ئەکات ,مەمکێکی داکستوەو مەمکێکی داوە بەخۆیدا... بوەستە هەتا خەوی لێ ئەکەوێ ئەگینا لەناوت ئەبات. زەنگی شەقلەباز لەشێوەی تۆپێکدا دانراوە چل کونی تێدایە چل دێو پارێزگاری ئەکەن بێجگە لەدەلەدێوەکەی پێشەوەولەهەر کونێکەوە ئاوازێك دێتە دەرەوە, ئەم کولووە لۆکەیەت ئەدەمێ هەر چل کونەکەی پێ

بئاخنە بەڵام نەیەڵی دەڵە دێوەکان خەبەریان بێتەوە, ئەوسا پڕی پێدا بکەو بیفڕێنە, بەڵام ئەکەی کونێکت لەبیر بچێت...)).

ئەم قسانەی پێ ووتو غەیب بوو!.

ئەحمەد سواربووەودو ڕۆیشت. گەیشتە جێگایەك ئەوەندەی باڵایەك دڕكو داڵ بەرز بووبوو وەودو وەك ئەشتەر لەخۆیی‌وئەسپەکەی ئەچەقی...

قسەی پیرە مێردەکەی بیرکەوتەوەو ووتی :

_(( دەك ئاوابێت باخو باخاتەکەو لەباخو باخاتەکەی ماڵی باوکم خۆشترە )).

هەرکەوای ووت دڕكو داڵ نەماو بوو بەباخو باخاتێك دڵی ئەکردەوە.

ئەختێکی تر ڕۆیشت گەیشتەسەرکانیە بۆگەنەیەك لەدوورەوە خەریك بوو بڕشێتەوە . بەڵام خۆی گرژ نەکردوو دابەزی ,دەمو چاوی لێ شتو ووتی :

((دەك ئاوابێت کانیە شەکراوەکە, ئەڵێ ی کانی بەهەشتی )).

کەئەمەی ووت کانی یەکە بوو بەشەکرە کانی یەك تێرت لێ نەئەخواردەوە.

پاش ئەمەئەحمەد هەر ڕوشت.. هەررۆشت هەتا گەیشتە جێگایەکی سامناك... ئەختێکی ترڕۆیشت لەدوورەوە بینی دەڵە دێوێك پاڵ کەوتووە, مەمکێکی داخستوەو مەمکێکی داوە بەخۆیدا, لەولاشەوە زەنگی شەقلەباز دانراوەچل دێوپاسەوانی ئەکەنو, لەهەزار ئاواز ئەخوێنێ . خەریکبووپڕی پێدا بکات بەڵام ئامۆژگاری پیرەمێردی بیرکەوتەوە, لەپەنایەکدا وەستا کەدەڵە دێوەکان خەویان لێ کەوت , ئەوسا دەستی کرد بەئاخنینی کونەکانی... سیو نۆ کونی گرتو کونێکی لەبیرچووبیگرێ.... کەپڕی پێدا کردنەعرەتەیەکی کێشا ئەوشاخو دۆڵە دەنگی دایەوەو دەڵە دێوەکان خەبەریان بوەوە... ئەحمەد کە ئاوزەنگی دا لەتەنگەی ئەسپەکەی هەر

نەوەنەبوو باڵ بگرێ... ئەسپ چوارناڵەی نەکردو دێوەکان بەدوایاندا...
کەگەیشتنە کانی یە بۆگەنە دەڵە دێوەکە نەڕاندی ((کانی یە بۆگەنە بیگرە!...))وەرامی دایەوە ((گوو بخۆ, گووی باوکت بخۆ, تۆ پێم نەڵێ ی کانی یە بۆگەنە ئەوپێم ئەڵێ کانی یە شەکراو, ئیتر چۆنی ئەگرم...))بەم جۆرە لەوناوچەیە ڕزگاری بوو . کەگەیشتنە نزیکی دڕكو داڵەکە دەڵە دێوەکە هاواری کرد:

دڕكو داڵ بیگرن!)).

دەنگێك لەدڕكو داڵەکە هاتو وەرامی دایەوە:

((گوو بخۆ, گووی باوکت بخۆ, تۆ پێمان ئەڵێ ی دڕكو داڵ ئەو پێمان نەڵێ باخو باخلت ئیتر چۆنی بگرین!)).

لەوێش ڕزگاریان بوو, ماوەیەکی تر ڕۆیشتن ئەوەندەی نەمابوو دێوەکان بیان گرنەوە ... ئەحمەد لەوە دڵنیابوو کەڕزگاری نابێ و دێوەکان ئەیان گرن ... لەپڕ ئەحمەد سابوونەکەی بیرکەوتەوە, توڕی هەڵدا یە بەر پێ ی دێوەکان,

سابونەکە بووبەتەلە بەردێکی گەورەو پانی لوس وەك سابوونی تەڕکراو, کەدێوەکان پێیان خستەسەر هەڵ خلیسکانو لەوکەندەلانە هەزار بەهەزارە بەنەعرەتەیەکی گەورەوە کەوتنە خوارەوەو هەپرون هەپرون بوون.

ئەحمەد بەدڵخۆشی یەوە گەڕایەوە.... زەنگی شەقلەبازیان خستە زوورێکەوە بەم ڕۆژگارە هەرگۆرانی ئەوتوهەردەنگەی ئاوازێکی لێ هەڵنەستا.

پیرێژنەکە کەئەمەی بینی زۆر سەری سوڕما, خۆی گەیاندە لای پادشاو پـێ ی ووت ((گەورەم, ئەم جارە ئەحمەدهاتەوەو بۆم نەفەوتا, بەلام فێڵ ماوە, هەر ئەیکەم بەقوربانی کەوشەکانت !)).

ماوەیەکی تری پێ چوو داپیرە چووە بن کڵێشەی فاتێوەو پێ ی ووت :

_ (( داپیرە لەدەورت گەڕێ, خـۆت بەوجوانیـە , کاکت بەوجوانیـە, زەنگـی شەقلەبازتان هەیە, حەیف نیە بابای نەسیمیشتان نەبێ ؟)) فاتێ ووتی:

_((داپیرە گیان بابای نەسیم چیە؟)).

_((کچـێکە, نەبکـەی , نـەبخۆی , تەماشـای سـایەی گـەردنی بکـەی, مێـوژە ڕەشکە بخوات لەگەردنی یەوە دیارە ,هەرقابیلی ئەومیەبیێتە براژنت)).

_(( ئینجا داپیرە چۆن پەیدا ئەکرێ؟)). ووتی:

_(( وەك جاری پێشوو بە ئەحمەد بڵێ بۆت پەیدا ئەکات..)).

فاتـێ چـەند ڕۆژێ خـۆی گـرتو دەنگـی نـەکرد, بـەلام لەدواییـدا پیرێـژن ئەوەندەی وتەوە لەخشتەی بردو ناچاری کرد داوالەکاکی بکات.

زۆر سـەرتان نەیەشـێنم , ئەحمـەد سـواری ئەسـپی زمـان زان بـوو, کەوتـە دەشت و کێو بەدوای(( بابای نەسیم)) داو...

لەسەر کانیو ناوەکەی پێشوو هەمان پیرە مێردی لێ پەیدابوو, پێی ووت:

_(( ها ئەحمەد , ئـەمجارە فاتـێی خوشـکت بۆکوێـت ئـەنێرێت ؟.. هـەبێو نەبێ سەرت بەفەتارەتێکا ئەدات!..)).

وەرامـی دایـەوە ((بـاپیرە گیـان , بـەخوا لەبـەر دڵـی خوشـکم ئەگـەر سوورزانیوەمە ئەمرم هەرچی بڵێ بەگوێی ئەکەم !)).

پـێی ووت: بەقسـەی مـن بکـە , مەچـۆ بـەدوای بابـای نەسـیمدا,ڕێگـای زۆر سەختەوتووشی دەردی سەری نەبی ...)).

ووتــی : ((بــەخواباپیرە گیــان بەلێنیکــەو داومــە بــەفاتیێی خوشــکمو باگەڕێمـەوە... ئەگـەر نـەتوانی وەك جـاری پێشـوو یارمـەتیم بـدەی باشـە، ئەگینا خوات لەگەڵ )).

پێی ووت: ((بەخوا ئەوەنـدەم پـێ نـەکرێ پێـت بڵێم کەچویتە بـەردەمی بابای نەسیم مەترسە، بترسیت ئەتکات بەبەرد!)).

ئەمەی ووتو غەیب بوو!.

ئەحمەد سواری ئەسپەکەی بـوو، کـەئاوزەنگی لێـدا ئەسـپەکەی هاتـە قسـەو ووتـی:(( ناتبـەم، ئـەبێ بگەڕێینـەوە !))ئەحمـەد کەوتـە پاڕانـەوەو بەهـەر جۆرێك بـوو ڕازی کـردو ڕۆیشـتن ... هـەر ڕۆیشـتن ... هـەر ڕۆیشـتن، هـەتا گەیشـتنە شـارێك، شـارج شـارێك، زینـدویـەکی تێدانـەبوو، هـەمووکرابوون بەبـەردوو بـەڕیز وەسـتابوون... نـەختێکی تـر ڕۆیشـتن، گەیشـتنە نزیکـی بابای‌نەسیم.

ئەحمــەد لــەدورەوە خــەریك بــوو ترســی لێ ئەنیشـت بــەڵام قسـەی پــیرە مێردەکەی بیرکەوتەوەو دانی بەخۆیـدا گـرتو لێ ی هاتـە پێشـەوە... بـەڵام چـی بینـی! پـەنا بـەخوا، بابای‌نەسـیم هـەرخۆی بابـای نـەسیم، پیرێـژنێکی چاوداپچـڕاو، دەم داقڵیشـاو ، قـژ بـژ، لـوت قـولنگ، .. پەنجـەکانی درێـژ ئەوەنـدەی تیرۆکێك، نینۆکـەکانی هەریەکـەی خەنجـەرێك بـوون بۆخۆیـان، دانەکانی ئەتوت شفرەی بـەرازن، بـەکورتی منـداڵی سـەر بێشـکە بـەبینینی زەندەقی دەچوو. لەدوورەوە هاواری‌کـرد .

((ئەحمەد، ئەگەر لەئازایی خۆت دڵنیانیت لەوە زیاتر مەیەرە پێشەوە... سـەیری دەورو پشـتی خـۆت بکـە، ئەمانـە هـەمویان جوانی وەك تـۆ بـوون بەڵام لەبەردەممدا خۆیان نەگرتو ترسان، منیش هەمویانم کرد بەبەرد...

تۆش جوانكەیتو بەری دنیات نەخواردوە , هەتا زود بگەڕێردوە, ئەگەر هەرناشگەڕێیتەوە وەرە پێشەوە لێم ... بێ ترس ئەم شوڵەم لەدەست وەرگرە ئەوساش ئەبمە هی تۆ .... بەڵام بترسیت ئەتكەم بەبەرد !)).

ئەحمەد غیرەتی دایە بەرخۆیو هاتەپێشەوە ... هەرلەبەرخۆیەوە ئەیوت:

_ ((نەترسیت .... بچۆ پێشەوە!)).

كەزیاتر لێ ی چوە پێشەوەو چاوەكانی بینی ئەوەندەی نەمابووبترسێو داچڵەكێ,بەڵام خۆی گرتو بەرەو ڕوی ڕۆیشت بابای نەسیم هانی ئەداو ئەیوت نەترسیتو وەرە پێشەوە .. دوایی پێ ی ووت:

_ (( مەترسە ... من ئەوەنیم كەلەبەرچاوتم.... هەر ئەم شوڵەم بێ ترس لەدەست وەربگرە ئیتر هەموو شت ئەگۆڕێ ...نەتر سیت )).

ئەحمەد ئەوەندەی تر غیرەتی پەیداكرد. بێ ترس گەیشتە بەردەمی, كەدەستی بۆ درێژكرد شوڵەككەی لێ وەر بگرێ پەنا بەخوا تیشكەكە ئەوەندە ترسناكو بەسام لەچاوی هاتە دەرێ لەعەزرەتدا ناوڕێكی دایەوەو داچڵەكی. ئەویش یەكسەر شوڵەكەی پیادا كێشاو كردی بەبەرد!)).

كەئەسپەكەی ئەمەی بینی هەر وەك باڵ بگرێ گەڕایەوەو لەبەردەرگای كۆشكەكەدا وەستا. كەفاتێ ئەسپەكەی بەبێ كاكی بینی كەوتەهاوارو فیغانو قژڕنینەوە. ئەسپەكە باسەكەی بۆگێڕایەوەو پێ ی ووت:

_ ((من ناتوانم لەمەزیاتر لێرە بمێنمەوە ... ماڵ ئاوا ئیتر من ئەڕۆم )).

فاتێ دەستی كرد بەپاڕانەوەو فرمێسك ڕشتنو پێ ی ووت:

((بەقور بانت بم بمبە بۆ ئەو شوێنەی كاكمت برد ... بامنیش ودك ئەو نەمێنم !..)).

ئەسپەکە وتی تائێستا سوار چاکێکی وەك کاکت سوارمن نەبوە, چۆن ئەهێڵم پاش ئەو کەسێکی تر جڵەوم بگرێتە دەست فاتێ ئەوەندە گریا ئەسپەکە دڵی نەرم بوو, ووتی:

((سواربە!)).

پیرێژن هەرچەند هەوڵی دا خاوی بکاتەوەو نەڕوا بەقسەی نەکردو ڕۆیشتن. داپیرە لەبەرخۆیەوە کەوتە بۆڵەبۆڵ و ووتی:

(( ئەی هاوار بۆ ئەو لەتکەو پەتکەی پادشا بەڵێنی پێداوم, ئەترسم فاتێ کاکی ڕزگار بکات ... ئەم ئەسپە بەد فەساڵە ئەهاتایەوە خەڵاتی خۆمم وەر ئەگرت ....)).

هەتا گەیشتنە نزیکی بابای ئەسیم ئەسپەکە هەر ئامۆژگاری فاتێی ئەکردو پێی ئەوت:

(( فاتێ, ئەترسیت .. چار هەر ئەوەیە ئەترسیت ئەگینا تۆش وەك کاکت ئەکات بەبەرد ... ئەترسیت کاکیشت ڕزگار ئەکەیت)).

کەگەیشتنە ئەوێ‌وبابای ئەسیم بەدی کرد لەدوورەوە بانگی کرد:

((فاتێ گیان یاخوا بەخێر بێی ... چەند ساڵەمن تاوان ئەکەم‌و پیاوان ئەکەم بەبەرد هەتا ئێستا کچێك نەهاتوە بۆلام ... حەز ئەکەم تۆ لەو هەمو پیاوانە ئازاتربیت و بێ ترس ئەم شوڵەم لێ وەرگرە ئەوسا ئەتوانی کاکت بکەیتەوە بەئینسان ...بەڵام تکایە مەترسە ... سەیری ڕوم مەکە گەترسم لێ ئەبارێ‌و زەندەقی خەڵك ئەبات ، سەیری دەرونم بکە کە پڕە لەبەزەیی ..ئەم ئیشانەی کردومن ئەبوایە هەر وام بکردایە, چونکە نابێ ترسنۆك ببێتە خاوەنم , کاکت زۆر ئازابوو بەڵام لەدواهەناسەدا لەرزی ... تۆ وەك ئەو مەبە , ئازابە, مەترسە, وەرە پێشەوە )).

هێنـدەی هانـداو ئامۆژگـاری كـرد ترسـی ڕەوی‌یـەوەو ئازایانـە بـەرەو ڕووی چـوو, شـوڵەكەی لەدەسـت سـەندو خێـرا شـوڵێكی دالەپەیكەرەكـەی كـاكی یەكسەر پژمی‌و بووەوە بە ئینسانەكەی جاران‌و باوەشیان كرد بەیەكتریدا.
فاتـێ پـاش ئەمـە شـوڵەكەی دا لەهـەموو ئەوانـەی تـریش كـەبابای ئەسیم كردبونی بەبەردو هەموویان زیندوو بوونەوە.
بابای ئەسیم پێ‌ی وت:
_ ((وەرە بەهێواشی شوڵێكیش بدە لەمن )).
كەشـوڵەكەی لێ دا بـو بەكچـێك, ئـەبخۆی ئەبكـەی هەرتەماشـای سـایەی گەردنی بكەی. مێوژە ڕەشكەی بخواردایە لەگەر دنی یەوە دیاربوو.
هەموو بەخۆشی گەڕانەوە ماڵێ.
كەپیرێـژن لـەدوورەوە بینـی دووبـارە گەڕاوەتـەوە بەهەڵـە داوان خـۆی گەیاندەوە لای پادشاو پێ‌ی ووت : ((گەورەم, نازانم ئەمانە دێون , درنجن , چین, تێ ناگەم, خۆ ئەم جارەش هاتنەوە, بەڵام قەیناكات ,ماوەمە !)).
ئەحمەد بابای ئەسیمی مارەكردوبەخۆشی‌و كامەرانی ژیان.
ماوەیەكی پـێ چوو ڕۆژێـك پیرێژنەكە بـەفاتێ‌ی ووت :فاتـێ گیـان , خـۆت بـەوجوانی یـە , كاكـت بـەوجوانی یـە, زەنگـی شـەقلەبازتان هەیـە, بابـای ئەسیم براژنتە, حەیف نی یە كچی شای پەریانیش نەبیتە براژنت ؟!)).
فاتـێ پـێ‌ی ووت : داپـیرە بیـبڕوە , لـەبیرت چـوەوە جـاری پێشـوو چـیمان بەسەرهات؟... بەخوا داوای والە كاكم ناكەم...
ئەوەی هەمانە سەرو زیادە , وازم لێ بێنە )).

پیرێژن پێی ووت: (( ئینجا داپیره بەقوربانت بێ خۆمن ئەم زانی وائەبی ، ئەوه ئەمری خوایە ... بەڵام خۆکچی شای پەریان کاری خراپی لێ ناوەشێتەوه, بەخوا ئەتان حەسێنێتەوه ...)).

ئەم جارەش ئەوەندەی قسه بۆکرد لەخشتەی برد. بەهەمان شێوەی جاری پێشوو ئەویش بەئەحمەدی ووت‌و بۆ ڕۆژی دوایی کاڵەو پێتاوی لەپێ کردو سواری ئەسپی زمان زان بوولێ دا ڕۆیشت.

هەر ڕۆیشت... هەر ڕۆیشت هەتا گەیشتە سەر کانی‌و ئاوەکە. زۆری پێ نەچوو پیره مێرده نورانی یەکەی لێ پەیدا بوەوەو بەگرژی یەوه پێی ووت:

((ها ئەحمەد, ئەم جارەش لەخشتەی بردی؟ هەتاکەی بەقسەی ژنان هەڵ ئەخەڵەتێی؟ بەڵای جاری پێشووت بیر چوەوه؟ ئاخریەکەی ئەم سەره سەری خۆت نی یه)).

ئەحمەد وەرامی دایەوه:

(( هەرچەنده بزانم تووشی بەڵاو مەترسی ئەبم ناتوانم دڵی فاتێی خوشکم بشکێنم )).

((باوابێ ... بەڵام چوونکه من تۆم خۆش ئەوێ‌و حەز ناکەم تووشی بەڵابیت بۆ دواجار یارمەتیت ئەدەم ... ئەگەیتە کانی‌و ئاوێکی گەوره, لەگوێ ئاوەکە, لەپشت دەوەنەکانەوه چاڵێ هەڵکەنە خۆت‌و ئەسپ‌و تولەوتانجیت خۆتانی تێدا بشارنەوەو بەلق‌و پۆپی درەخت خۆتان داپۆشن. زۆری پێ ناچێ چل کۆتری سپی دێن , پەڕەکانیان دائەماڵن‌و هەریەکەیان ئەبێتە کچێکی ئەوەنده جوان وێنەی نیه بەڵام هیچ خۆت تێک مەدەو مەجووڵێ, ئەمانە هەموویان کەنیزەکی کچی شای پەریانن... دوایی

کۆترێکی تری سپی دێت، ئەویش پەڕەکانی دائەماڵێ‌و لەسەر لق‌و پۆپی سەرچاڵەکەی‌تۆ هەڵیان ئەخات‌و ئەچێ بۆمەلەکردن ... تۆش لەسەرخۆ دەست بکێشەوبیان دزەو لەشوێنی خۆتدا بێ دەنگ بمێنەوەو چاوەڕێی بکە .. ئەوەیان کچی شای پەریانەو کەبەڕووتی دەست ئەکات بەمەلەکردن ئەوسا ئەزانی مانای جوانی‌و نەشمیلی چی یە! دوایی هەر چل کۆترەکان پاش مەلەکردن‌و خۆ ووشك کردنەوە پەڕەکان لەبەر ئەکەنەوەو ئەبنەوە بەکۆتر، چاوەڕێ بکە هەتا ئەوی تر لەمەلەکردن ئەبێتەوە.

کەدێت پەڕەکانی لەبەربکاتەوە سەیر ئەکات نەماوە ئەزانێ براوە، هاوار ئەکات‌و پێت ئەڵێ پەڕەکانم بدەرەوە، پێی بڵێ لەگەڵم وەرە ئەتدەمەوە. سوێندت بۆ ئەخوات کەلەگەڵت دێت بڕوای پێ مەکەو، داوای لێ بکە سێ جار بەشیری دایکی‌و بەرنجی باوکی سوێندت بۆ بخوات، ئەو سوێندە هەرگیز نایشکێنێ لەبەرئەوە بەوجۆرە سوێندی بۆخواردی پەڕەکانی بدەرەوە چونکە لەگەڵت دێت ...)).

ئەمانەی بەئەحمەد وت‌و غەیب بوو......

ئەحمەد سواری ئەسپەکەی بوەوە و ڕۆیشت... هەر ڕۆیشت هەر ڕۆیشت هەتا گەیشتە کانی‌و ئاوەکەکەپیرە مێردەکەپێی ووتبوو، لەپشت دەوەنێکەوە چاڵێکی هەڵکەندو خۆی شاردەوەو بەلق‌و گەڵا دای پۆشی. زۆری پێ نەچوو چل کۆتری سپی نیشتنەوە، پەڕەکانیان داکەندو دایانن بەسەر دەوەنەکانداو دەستیان کرد بەمەلەکردن و ئەحمەد بینی بوون بەچل کچ هەموو وەکیەك‌و بەقەد یەك جوان. دوایی کۆترێکی سپی نیشتەوەو، وەك ئەوانی تر پەڕەکانی داکەندو خستیە سەرلق‌و گەڵای سەرچاڵەکە کەئەحمەد خۆی تێدا حەشار دابوو. ئەویش بەدزیەوە پری

پێدا کردو لەبن خۆیدا شاردی یەوە. کەئەحمەد تێی ڕوانی چی بینی! پەنا بەخوا لەجوانیو شۆخو شەنگی ئەو کچە نایابەی لەژێر پەڕی کۆتردا شاردرابووەوە.. ئەحمەد چاوی لێ نەئەتروکاندونەوەندەی نەمابوو لەهۆش خۆی بچێت. ئەویش وەك ئەوانی ترمەلەی کرد, وشکیان کردەوەو هات خۆی لەبەرکاتەوە, کەبینی پەڕەکانی نەماوە کەوتە هاوارکردنو گریانو ووتی: ئەی هاوار ئینجا من بەبێ پەڕەکانم چی بکەم ... چۆن بچمەوە لای دایكوباوکم؟ ئەی ئەو کەسەی پەڕەکانت بردوم, دێوی... درنجی, ئادەمیزادی... هەرچی هەی, بیکە بەخاتری خوا بمدەرەوە, چیت ئەوێ بەجێ ی ئەهێنم..))

ئەحمەد لەچاڵی پشت دەوەنەکەوە وەڵامی دایەوە:

_(( ئەمەوێت بێ یت لەگەڵمو شووم پێ بکەیت)).

کچی شای پەرییان سوێندی بۆخوارد کەدێت لەگەڵی, بەڵام ئەحمەد پێی ووت:

_((من بەم سوێندانە بڕوا ناکەم, سێ جار بڵێ بەشیری دایکموبەرەنجی باوکم لەگەڵت دێم پەڕەکانت ئەدەمەوە, ئەگینا ئەیان سوتێنم !)).

کچەکە حەپەساو ووتی:

_((ئەی هاوار بەماڵم!.. ئەم سوێندەی ئێمەت چۆن زانی؟)).

_((ئەگەر نەمزانیایە نەدەهاتم!...)).

کچی شای پەریان سێ جار ووتی بەشیری دایکموبەرەنجی باوکم دێم لەگەڵتدا, دواییش پێ ی ووت:

_(( بەلام بەمەرجێك دێم لەگەڵت, هەركاتێك سێ قسەم بەقسە نەكەی تەلاقم كەوتبێ!... ڕێگاشم بدە بگەڕێمەوە لای دایكو باوكو كەس‌وكارم دوعاخوازی یان لێ بكەم‌وئەوسا دێمەوەبۆ ئێرە, چاوەڕێم بكە..)).

ئەحمەد ووتی:

_((باشە...)). پەڕەكانی دایەوەو بەپرتاو لەبەری كردەوەو بووەوەبە كۆترە سپی یەكە. لەگەڵ چل كۆترەكەی تردا دایان لەشەقەی باڵ, كچی شای پەریان پێشیان كەوتو لەچاو وون بوون.

ئەحمەد لەجوانی‌ونازداریی كچی شای پەریان تاس بردبوویەوەو بێ جوڵە دانیشتبوو. لەدڵی خۆیدا ووتی:

_((تۆبڵێ ی ئەم نازدارەم بۆبێتو گاڵتەی پێ نەكردبم؟ تۆبڵێ ی سوێندەكەی بشكێنێتو نەیەتەوە؟)).

كەماوەیەكی پێ چوو و, هەر نەهاتەوە ئەحمەد دۆش داماو بەخۆی ووت:

_(( ئای كە ساویلكەو خۆش بڕوابووی!... تۆ وەنەبێ هەر فاتی ی خوشكت لەخشتەت بەرێ... ئاخر چۆن بڕوات كردو هەڵ خەڵەتایت؟.. دەبخۆ دەی ئەوە دەردت بێ, پاش ئەم هەموو دەردی سەری یە لۆشە لۆش بەدەستی بەتاڵ بگەڕێرەوە!... بەلام باهەر چاوەڕێ بكەم, بڕواناكەم درۆبكات..)).

قسەكەی تەواو نەكردبووكەكچی شای پەریان پەیدابووەوەوبەیەكەوە گەڕانەوە.

داپیرە كەئەم جارەش لەسەر گرتنی پیلانەكانی نائومێدبوو چووەلای پادشاو ووتی:

_(( پادشا چیم لێ نەكەیت وام لەبەردەستتدا, من ئیتر هیچم پێ ناكرێت... بەمن نافەوتێ)).

پادشائاگری تێبەر بوو.. ووتی: خۆم چاری ئەکەم!)).

بۆسبەینێ چەند پیاو ماقووڵێکی ناردەلای ئەحمەدو پێ یان ووت (( پادشا داوای لێبوردن ئەکات کەپیاوێکی بەشانو شەوکەتی وەك جەنابت ماوەیەکە لەم شارەیت هەتا ئێستا بەخزمەتت نەگەیشتووە... لەبەر ئەوە تکات لێ ئەکات گەورەی بکەیتو میوانداری قبوڵ بکەیت!)).

ئەحمەد, کەهیچ ئاگای لەبەندو باو , و گۆبەندی پادشا نەبوو بەدڵخۆشییەوە قبوڵی کردو ڕۆژی میوانداری دیاری کرا.

پادشا فەرمانی دا لەبەردەرگای دەرەوەی کۆشکەکەوە هەتا بەر دەرگای دیوەخان زیندان هەڵبکەنو ناخەکانی بزمار ڕێژ بکەنو بەفەرشی نایاب سەرەکانی داپۆشن بەڵکو ئەحمەد بەسەر یاندا بڕواتو تێیان بکەوێتو فەرمانیشی دا نەگەرلەوە ڕزگاری بوو خواردنەکەی پڕبکەن لەژەهرو دەرمانخواردی بکەن.

بێینەوە سەرەوکاری ئەحمەد, کەلەماڵەوە ووتی پادشا بانگ هێشتی کردووە کچی شای پەریان تێك چوو, ووتی: (( ئەی نابێت نەچیت )). وەڵامی دایەوە: (( لەدەست دەرچووەوە بەڵێنم داوە, ناگرێت )) پێ ی ووت : (( پادشا نەیەوێت لەناوت بەرێ , لەبەر ئەوە چیت پێ ئەڵێم بەقسەم بکە نەگینا بەساغی نایەیتەوە)).

ووتی: (( پادشا بۆچی من لەناو ئەبات! نەئەمناسیٚونەخراپەم بۆی هەبووە )).

ووتی : (( دوایی ئەیزانی مەسەلە چیە ... بەقسەم ئەکەی؟ )).

_ بەڵێ, بەقسەت ئەکەم )).

_(( کەئەگەیتە بەر دەرگای کۆشکەکەی فەرمووت لێ ئەکەن کەبەسەر فەرشەکاندا بڕۆیت, بەتوولەڕێگاکەی قەراغیدا بڕۆو بڵێ کەئەسپەکەت فێری سەر فەرش نەبووە, نەکەی بتخەڵێنن‌و بەسەر فەرشەکاندا بڕۆی, ژێرفەرشەکان هەموو زیندانە وە تێیان ئەکەوی ... ئەوخواردنەی ئەشت دەنێ نابێت بچێتە سکتەوەوبیخۆی! )).

_ (( ئەی چی لێبکەم؟ )).

_(( کونێك ئەکەمە قوڕگتەوەو تورەکەیەکی لەژێر جلەکانتەوە تێ ئەکەم‌و خواردنەکە ئەچێتە ئەوێوە ئیتر بیخۆو ترست نەبێت ..)).

سەرتان نەیەشێنم, ڕۆژی میوانداری ئەحمەد بەسەر فەرشەکاندا نەڕۆیشت‌و هەرچەندە پادشا فەرموو, فەرمووی لێکرد گوێی نەدایەو ووتی ئەسپەکەی فێرنەبووە, کەلەسەرمێز دانیشتن پادشا چاوەڕێ بوو یەکەم پارو کەخواردی بەلادا بێت‌و بمرێت, بەڵام هەرئەی خواردو خۆشاوی لەتکە هەرمێی پڕلەژەهری ئەکرد بەسەرداو کاری تێ نەئەکرد چونکە یەکسەرئەچووە توورەکەکەی ملی... پادشا تووڕە بوو, وایزانی کەنیزەك‌و چێشتکەرەکانی ژەهریان بۆتێنەکردووە, لەبەر ئەوە خۆی هەستاو چووە ژووری چێشت لێنانەکەو بەچنگ دەستی کرد بەژەهر تێکردن.

کەئەمەش کەڵکی نەگرت هیوای بڕا.

کەئەحمەد گەڕایەوە ماڵێ کچی شای پەریان توورەکەکەی لەملی کردەوەو لەو خواردنەی ناوی ئەوەندەی دەنکە نۆکێکی هەڵدا بۆ تووتکە سەگێك, هەرکەگەیشتە دەمی, یەکسەر دەمی دابەیەکداو تۆپی . کچی شای پەریان بەئەحمەدی ووت:

(( ئێستا بۆت دەرکەوت کەپادشا ئەیەوێ لەناوت بەرێ!
ئیمجا سبەینێ تۆبنێرە پادشا بانگ بکە بەمیوانی, بەڵام هەرچیم کرد نابێ قسەبکەیت )).

رۆژی بانگهێشتنەکە میوانداری یەکی شاهانەی بۆپیاوان و دەست و پێوەندی پادشا سازکرد, بەڵام پادشای بەتەنها خستە ژوورێکەوەو کەهەموو لەنان خواردن بوونەوە سینی یەکی پڕکرد لەئێسقان و سەرپۆشێکی پیاداو بەئەحمەدی ووت بۆی بەرێت. ئەحمەد کەنارەزایی پیشاندا چۆن کاری وا لەگەڵ میواندا ئەکرێت پێی ووت:

(( ئەم ووت چیم کرد نابێ قسەبکەی !... چیت پێ ئەڵێم وابکەو هەقت نەبێ... دوایی بۆت دەرئەکەوێ مەبەستم لەم کارە چیە )).

ئەحمەد ناچار سینیە پڕئێسقانەکەی هەلگرتوو کچی شای پەریان بەدوایەوە . کەگەیشتنە لای پادشا کچی شای پەریان سینیەکەی لەئەحمەد وەرگرتوو لەبەر دەم پادشادا دایناو سەرەگەی هەڵدایەوەو ووتی:

(( پادشام فەرموو !)).

پادشا کەئەمەی بینی ڕەنگی تێك چوو , ئاگری تێ بەربوو بەڵام خۆی گرتوو لەسەرخۆ بەئەحمەدی ووت:

_(( ئەمەچیە؟ بۆچی من سەگم ئێسقان بخۆم؟ )).

کچی شای پەریان وەڵامی دایەوە..

_ ((پادشام ئەگەر سەگ نەبیت چۆن تووتکەسەگت ئەبێ؟)).

پادشا کەئەمەی بیست تاس بردییەوەو پەنجەی خۆی گەست.

کچی شای پەریان فاتێی بانگ کردو بەپادشای ووت:

_(( پادشـــام , ئەمـــە ئـــەو دوو تووتكـــە ســـەگەن كـــەكاتی خـــۆی ژنـــە بەسەزمانەكەتboooni ... منیش بوكتم! .... )).

پادشام ناوچەوانی ئەوو, ئەملاوئەولای فاتیٚو ئەحمەدی ماچ كردو غەمو پەژارەی ڕەویـەوە. كەچووووەوە ماڵەوە فـەرمانی دا دایكی ئەحمـەدو فاتیٚ دەربهێنن... بەستەزمانە ئەوەندە لەگەڵ سەگدا ژیابوو ئەوەندەی نـەمابوو زمانیان فێربێت.. بردیانـە حـەمام پاك شـتیانو جلی شاژنانە یان لەبـەر كـرد. ئەوسـاهەردوو خوشـكەكەیو پیرێژنەكـەیان هێنـا یـەكی لنگێكیـان بەستن بەئەسپێكەوەو ئەقیزەیان تێوەژەندنو هەریەكە بەلایەكدا هـەڵیان تیزاندو لنگیان هەڵقڵیشاندن .... هەمووبەیەكتری شادو شوكربوونەوە .

**منیش هاتمەوە هیچیان نەدامیٚ .**

# تیخ شوناس

هەبوو....نەبوو... كەس لەخوا گەورەترنەبوو , كەس لەبەندەی خراپ ڕوو ڕەش ترنەبوو, پادشایەك هەبوو تەمەنێكی دوورو درێژی بەسەر بردبوو, مندالی نە بوو بوو . ڕۆژێك وەزیری دەستە ڕاستی بانگ كردو ووتی:

_(( وەزیری خۆشەویست, واسەرم لەگوێی گۆڕ ئەلەرزێ و هەتا ئێستا مندالێكم نەبووە ببێتە جێ نشینم. بڕیارم داوە دارعەساو كەشكۆلی دەروێشی هەلگرم و بڕۆم , ئەگەرهاتمەوە ئەوە باشە , ئەگەر ئەشها تمەوە ئەوە تاجەكەی سەرم, خۆت ببە بەپادشاو بەبەزەیەوە فەرمان بكەو چاوت لەهەژارانەوە بێ, ئەگەر وتیشیان كوا بلێ چووە بۆ سەیاحەت )).

وەزیر هەرچەند هەولی دا ئەم بڕیارەی پێ هەلبوەشێنێتەوە كەلكی نەگرت. دۆعاخوازی لە وەزیرو ژنەكەی كردو دارعەساو كەشكۆلی هەلگرت و جلی دەروێشی لەبەركردو ڕۆیشت.

هەر ڕۆیشت , هەتا گەیشتە سەركانیو ئاوێك.. زۆر ماندوبوو خەوی لێ كەوت . پیرە مێردێك هاتە خەوی و پێی ووت:

((پادشا بۆچی بەبەشی خوا ناڕازیت و سكالا ئەكەیت, هەر ئێستا كەهەستای لەخەو, سێوێك و چەقۆیەكم خستۆتە گیرفانتەوە , بڕۆرەوە مالێ, شوكری خوابكەو بەو چەقۆیە سێوەكە دووكەرت بكە, كەرتێكی

خۆت بیخۆو کەرتێکی ژنەکەتو شەوێ بچۆرە لای سکی پڕ ئەبێو کوڕێکی ئەبێت ناوی بنێن تیغ شوناس. بەلام ئەوە لەیاد نەکەیت کە ئەم چەقۆیە هەمیشە ئەبێت بەبەر پشتێنەکەیەوەبێت, هەرکەلێ ی کرایەوە یەکسەربێ هۆش ئەبێتو پیایدا کرایەوە دێتەوە هۆش خۆی )).

پادشا کەخەبەری بووەوە باوەڕی بەم خەوەنەکرد, بەلام کەدەستی کرد بەبەرباخەلێدا سێوو چەقۆکەی تێدابوو, بەجارێك هیوای پەیداکردو بەهەلەداوان گەڕایەوە مالەوە. سێوەکەی کرد بەدووکەرتەوەو لەگەل ژنەکەیدا خواردیان.

شەوێ چوەلای ژنەکەیو نووست.

سەرتان نەیەشێنم ژنی پادشا سکی بەرز بووەوەو پاش نۆمانگو نۆ ڕۆژو نۆ سەعاتو نۆ دەقیقە کوڕێکی بوو,بەلام بێ هۆشو گۆش . هاواریان بردەبەر پادشا کە کوڕەکەی بەو جۆرەیە. چەقۆکەی بیرکەوتەوە , دایە دەستیان ووتی :

_(( بڕۆن خێرا پشتێنێکی ببەستنو ئەم چەقۆیە بکەن بەبەر پشتێنەکەیدا ... بەلام ئاگاتان لێ بێ ئەم چەقۆیە وون نەبێت )).

پادشا چۆنی ووتی وایان کردو یەکسەر مندالەکە هۆشی بەبەردا هاتو دەستی کرد بەگریان )).

بالەکورتی بیبڕینەوەو سەرتان نەیەشێنین ... تیغ شوناس گەورە بوو... جارێك بازرگانێکی شارەکەیان چووبۆ ولاتان بۆ توجارەت ... لەوێ ویستی دیاریەك بکڕێت بۆ کوڕی پادشا, هەرچەند گەڕاو بیری کردەوە نەیزانی چی بۆ بکڕێت.

لێکی دایەوەو بەخۆی ووت:

(( چی بۆ بکرم باشە .... خۆ ئەولەهیچی کەم نیەو هەرچی بکرم هەیەتی....)).

لەدوکانێك نیگارێکی زۆر جوانی کچێکی دۆزیەوە, بە خۆی ووت:

(( بەخوا ئەمە باشترین دیاریە بۆ کوری پادشا )). وبۆی کری و کەهاتەوە وڵات پێشکەشی کرد. تیغ شوناس هەرکەچاوی پێی کەوت بەتیری ئەشقی بریندار بوو . خەوو خۆراکی لێ هەلگیرا ,هەتا ئەهات کزو لاواز ئەبوو رەنگی هەلێ ئەبزرکا .... حەکیمیان بۆهێناو دەرمانی دایە بەلام کەلکی نەگرت و ... رۆژ بەرۆژ کزتر ئەبوو. باوکی خەم و پەژارە دایگرت و ترسی لێ نیشت و نەی ئەزانی چی بکات ... لەخوا ئەپارایەوە ئەی ووت:

خوایە , چەند ساڵ بوو مندالت نەدامێ, لەم دوایەدا کەدەرووت لێ کردمەوەو مندالێکت دامێ بۆچی وات لێ کردو خەریکی لێم ئەسێنیتەوە؟ دەچارێکم بکە!)).

رۆژێك بەبێدەنگی خۆی کرد بەژورەکەیدا,بینی سەری بە سەر وێنەیەکدا شۆرکردۆتەوە ئەگری ... ئەوسا مەسەلەکەتێگەیشت و . پێی ووت: (( کورم ئەمە چیەو بۆچی بەسەر ئەم وینەیەدا ئەگریت؟)).

تیغ شوناس بەشەرمەوە وەرامی دایەوە:

((بابە گیان چی بێ لەتۆ نهێنی ... بەتیری ئەشقی خاوەنی ئەم وینەیە گرفتار بووم تەنها خاوەنەکەی چارم ئەکات ئەگینا چرای ژیانم ئەکوژێتەوە )).

_((کورم ئەقلت بێ, خوائەزانێ ئەمە دێوە, درنجە, ئادەمیزادە, خاوەنی هەیە, ماوە, چی. هۆش بێنەرەوە سەرخۆت وئەم کەلکەلەیە لەمێشکی خۆت دەربکە, دەست ئەخەیتە سەرهەرکچێك بۆت ئەهێنم و وازلەم بەزم و

ڕەزمەبهێنەوبەم کۆتایی تەمەنەمەوە تووشی دەردی سەری‌و پەژارەم مەکە)).

پادشا زۆری ووت‌و تیغ شوناس کەمی بیست, لەدوایی دا پیی ووت:

_((بابەگیان, داوای لێ بوردنت لێ ئەکەم کەبۆ یەکەم جار لەقسەت دەرئەچم. بەدەست خۆم نیەو کارلەکار ترازاوە, چارم تەنها خاوەنی ئەم وێنەیەیەو هیچی تر.... ئەگەر بۆم نەهێنن سەری خۆم هەڵئەگرم‌و ئەڕۆم بەدوایدا)).

_((ئاخر کوڕە شیرینەکەم لەکوێ بۆت بهێنم؟ وەك پێم ووتی کەس نازانێ ئەمە چیەو کێ‌یە... چۆن داواکاری واکراوە؟)).

_(( بابەگیان چارم نیە, بەیانی ئەڕۆم)).

کەپادشاهیوای‌بڕا بۆ ڕۆژی دوایی کەل‌و پەلی ڕێگای بۆ ئامادەکرد, تیغ شوناس کاڵەوپێتاوی ئاسنی لەپێ کردوێ داڕۆیش. هەرڕۆیشت ... هەر ڕۆیشت... هەتا گەیشتە درەختێکی گوێ کانی‌و ئاوێك. بینی لاوێك دانیشتوەو بەسەر وێنە یەك دا ئەگری. سڵاوی لێ کردو لایەوە دانیشت‌و پیی ووت:

_(( هابرا خێرە وا بەکوڵ ئەگری؟... چیت لێ قەوماوە پێم بڵێ, بەڵکو چارێکت بکەم )).

لاوەکە سەری هەڵبڕی‌و پیی ووت:

_(( کاکی خۆم دەردم کاری یە بەتۆ چار ناکرێ... خوات لەگەڵ, بڕۆ بەلای کاری خۆتەوە)). کەتیغ شوناس لێ ی دووبارە کردەوە ووتی:

_((بۆ خاوەنی ئەمە ئەگریم!)).

وێنەکەی پیشانی تیخ شوناس داو ووتی: (( ماوەیەکی زۆرە عەودالی ئەمەم, جیهانم پشکنیوە بەدوای دا بۆم نادۆزرێتەوە )).
تیخ شوناسیش وێنەکەی لەگیرفانی دەرهێناو ووتی:
(( دەردمان وەك یەکە, منیش سەری خۆم هەلگرتوەو بەدوای ئەمەدا وێلم ... ئەگەر بەهاوڕێی خۆتم قبول ئەکەیت مەرج بێت هەتا تۆ بە ئاوات نەگەیەنم هەولی خۆم نەدەم)).
وەلامی دایەوە: (( هەتامردن تۆبرا گەورەو من برا بچوك)). باوەشیان کرد بەیەکتری داو تیخ شوناس چیرۆکی خۆی بۆ گێڕایەوە, باسی چەقۆ کەشی بۆکرد, ئەویش ووتی:
((منیش ناوم ئەستێرە ژمێرەو کارم بەخت خوێندنەوەیە )). لەوەو پاش لێ یان داو ڕۆیشتن.
هەر ڕۆیشتن... هەر ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە بن دارێك بینیان بەهەمان شێوە لاوێك دانیشتوە بەسەر وێنەیەکی شێوە پەریدا ئەگری. سلاویان لێ کردو لایەوە دانیشتن, بۆیان دەرکەوت کەئەویش ئاشقی ئەو وێنەیەیەو بەدوویدا عەودالە, وتیشی ناوی دەریابڕەو کاری گەڕانە بەناو ئاودا.
ئەمانیش بەسەرهاتی خۆیان بۆگێڕایەوەو تیخ شوناس پێی ووت:
(( ئەگەر بەبرای خۆتمان قبول ئەکەیت مەرج بێت هەتا تۆ بەئاوات نەگەیەنم هەولی خۆم نەدەم )).
وەلامی دایەوە : ((هەتا مردن تۆبراگەورەو من برا بچووك)). یەکتریان ماچ کردو لێ یان دا ڕۆیشتن .

هەر ڕۆیشتن... هەر ڕۆیشتن... کەم ڕۆیشتن یان زۆر ڕۆیشتن ئەوە هەر خوائەیزانێ... گەیشتنە شارێك. لەدەرگای ماڵێکی داڕوخاوی قەراغ شاریان داو پیرێژنێك لێ ی کردنەوە, تیخ شوناس پێ ی ووت:

_((داپیرە گیان میوان ڕائەگری؟)).

پیرێژن وەڵامی دایەوە : (( میوانێك بەمن ڕازیبێت بۆ بانی چاوبێت)).

((ئێوارە خواجی دابوو بۆی دانانو خواردیان. کەوتنە پرسیارکردن دەربارەی شارو ژیانی. پیرێژنەکە ووتی: (( داپیرە لەدەورتان گەڕێ, شار زۆر خۆشە, پادشامان زۆر باشە, بەڵام بەڵایەکمان بەسەرداهاتوە دڵی هەموو کەسێکی شێواندوە...

پادشامان تاقە کچێکی هەیە. حەوت دێو حەزیان لێ کردوە ئەیانەوێت بیڕفێنن... لەبەر ئەوە پادشا خستوویەتیە قەفەزێکی ئاسنینەوەو بەزەویەوە قایمی کردووە لەترسی دێوەکان ... هیچ خەمێکی ترمان نیە ئەمەنەبێت )).

تیخ شوناس ووتی:

_ ((داپیرە بنوو , خوا کەریمە)).

شەوێ چووە دەرەوە بەرەو ماڵی پاشا. بینی حەوت دێو مقۆ مقۆیانە, لەگەڵ یەکتریدا قسە ئەکەنو بە یەکتری ئەڵێن

_((ئەمە چەند شەوە دێینو بەدەستی بەتاڵ ئەگەڕێنەوەو, هیچمان پێ ناکرێ...ئابڕومان چوو و, بێ دەسەڵاتیمان بۆتە بنێشتە خۆشەی ژێر دانی هەموو کەس)).

_ ((ئەبێ کۆتایی بەمە بهێنین)).

_ ((زۆر عەیبو شورەییە)).

((ئەبێ ئەمشەو بیرفێنین)).

((ئەم کارەمان پێ ئەکرێ بۆچی باشین؟)).

((ئەگەر بۆشمان نەرفێنرا ئەیکوژین)).

_ ((نابێ، ئابێ ئەبێ بیرفێنین)).

ماوەیەکی زۆر خەریکی ئەم قسانە بوون. تیخ شوناس کە زانی کار گەیشتۆتە ئەم ڕادەیە خۆی لێ ئاشکرا کردن. زۆر سەریان سوڕماو خەریک بوون پەلاماری بدەن ، پیّ ی ووتن:

_ ((ڕاوەستن، تەگبیری ئەم کارە لای منە ...)).

وتیان: ((چۆن؟)).

ووتی: ((ئەم: کارە واناکرێو بەزۆر نابێ، من سەرئەکەومە مالّی پادشا، یەك یەك ئێوە هەڵئەکێشمە سەرەوەو، ڕاتان ئەهێڵمە ئەودیوەوەو دوایی هەموو بەیەکەوە بەقەفەزەکەوە، هەڵی ئەکێشین‌و ئەیبەین)).

سەرۆکی دێوەکان پێی ووت:

_ ((باشە تۆ لەم کارە چیت دەست ئەکەوێت؟)).

_ ((من دژمنایەتیم لەگەڵ پادشادا هەیەو ئەمەوێ تۆڵەی لێ بستێنم )).

تیخ شوناس چووە سەرحەسارەکەو بە کەمەند یەك یەك هەڵیکێشانە سەرێ، لەوێ شمشێرێکی لێ ئەدان‌و، ملی ئەپەڕاندن‌و لچ‌و لێوی ئەکردن‌و لاشەکانیانی فڕێ ئەدایە مالّی پادشاوە، بەم جۆرە هەرحەوتی کوشتن‌و لچ‌و لێوی بڕین‌و خستیە دەستە سڕەکەیەوەو گەڕایەوە مالّی پیرێژن، خۆی کرد بەژێر جێگاداو نوست.

بەیانی زووو پیرێژن خەبەری کردنەوەو پێی ووتن: (( هەستن بەقوربانتان بم, بەخوا پێو قەدەمتان بەخێرە, ئەم شەو هەرحەوت دێوەکەیان کوشتوەو ئێستالەشار هەڵپەڕکێو ئاهەنگە )).

ووتیان: ((چۆن؟)) ووتی (بەڵێ) زۆری پێ نەچوو جارچی جارِیدا کەکێ دێوەکانی کوشتوە بێت پادشا خەڵاتی بکات.

هەزارەها کەس چووە لای پادشاو ووتی :

_(( پادشا من کوشتومن !)).

_(( ئەی کوانیشانەکانیان؟)).

کەنەیان ئەزانی مەبەستی پادشا چی یە دەری ئەکردن.

کەس نەما نەچێتەکۆشکی پادشاو نەڵێ من کوشتومن.

پادشا پرسی (( کەس ماوە نەهاتبێ؟)).

ووتیان: (( پادشا, کەسی شارنەماوە, تەنها لەو قەراغ شارە پیرێژنێك هەیە ئەم شەو سێ میوانی هاتوە هەرئەوان ماون)).

ووتی: (( بیان هێنن!)).

هەرسێکیان بردن بۆ خزمەت پادشا .کچەکەی بەڕووخۆشی یەوە لەتەنیشتەوە دانیشتبوو. هەرکەچاویان پێی کەوت ناسیانەوە کەئەو کچە یە وێنەکەی بەئەستێرە ژمێرە. پادشا پێی ووتن:

_(( ئەگەر ئەو دیوانە ئێوە کوشتوتانە دیارە نیشانەکەیتان هەلگرتوە, وایە ؟)).

تیغ شوناس ووتی: ((پادشام بەرخورداربێت, بەڵێ من کوشتوومنو ئەمیش نیشانەکانیانە )).

ئەمەی ووتو دەسەسڕەکەی بەلچو لێوەکانەوە لەبەردەم پادشادا گردەوە..
پادشا هەستایە سەرپێ، ناوچەوانی ماچ کردو پێی ووت:
(( کوڕی خۆشەویستم چیت ئەوێ داوابکە !)).
وەلآمی دایەوە:
((گەورەمان, ئەو گوڵەی لەباخدایە پێشکەشی ئەم برایەمی بکە! )).
پادشا ووتی: ((واپێشکەشم کردا )).
حەوت شەوو, حەوت ڕۆژ دایان لەتەقەی دەهۆڵو زوڕناو کچی پادشایان لە ئەستێرە ژمێر مارەکرد.
پاش حەوت ڕۆژ تیخ شوناس پێی ووت: (( ئێوە لێرە بمێننەوە, ئێمەش ئەچین ئەگەڕێین بەدوای خۆشەویستی خۆماندا)).
پێی ووتن: منیش لەگەڵتاندا دێم)) .
((نەء تۆ لەگەڵ ژنی خۆت بەختیاریی ڕابوێرە بەڵام لەبیرت نەچێ جارجارە سەیری ئەستێرەکامان بکە بزانە چۆنین, ئەگەر ئەستێرەکانمان لەکزی دابوو فریامان بکەوە!)) دۆعا خوازیان لەیەکتری کردو ڕۆیشتن.
هەر ڕۆیشتن ... هەر ڕۆیشتن ... هەتا گەیشتنە شارێکی تر. بەهەمان شێوەی پێشوو چوونە ماڵی پیرێژنێکی قەراخ شار. کەنێوارە چێشتی بۆلێنان تیخ شوناس چاوی لێ بوو لەباتی ئاو میزی کردە جامێکەوە تێی کرد. لەمە زۆر سەری سوڕماو پێی ووت:
((داپیرە گیان ئەوە چی ئەکەیت؟ بۆچی لای ئێوە عادەتە میز دەرخواردی میوان بدەن؟)).
پیرە ژنەکە زۆر تەریق بووەوەو پێی ووت:
(( بەقوربان چی بکەم, ئاومان نیە.)).

_(( چۆن؟)).

_(( لەم شارەدا تەنها سەرچاوەیەکمان هەیە ناوی لێ بخۆینەوە ئەژدیهایەك پێمان فێربووە بەری ئاوەکەی لێگرتووین، ئەبێ هەفتەی کچێکی بە دەهۆڵو زورناوە بۆ بەرین، هەتا خەریکی خواردنی ئەو کچە ئەبێت بەری ئاوەکە بەرەڵا ئەکاتو هەرکەسێك فریا بکەوێت ناو ئەگرێت، منیش بەم پیریە ئاوم ئەوەندە بۆ ناگیرێ بەشی هەفتەیەکم بکات.)) .

تیخ شوناس ووتی: ((داپیرە گیان ئەی کەس نیە دەرەقەتی بێت؟)).

_((داپیرە لەدەورت گەڕێ زۆر کەس هەولّی دا بەلاّم هەمووی کوشتن. بەیانیش نۆرەی تاقە کچەکەی پادشایە ئەبێ بۆی برازێنینەوەو نارایشتی بکەنو بۆی بەرنو دەرخواردی بدەن)).

_((داپیرە گیان بنوو خوا کەریمە! )).

بەیانی لە تەقەی دەهۆڵو زوڕنا خەبەریان بوەوە، داپیرە سەتڵی هەلگرتو بە پرتاو بۆی دەرچوو، تیخ شوناسیش بەدوایەوە. ڕوانی هەموو شار خرۆشاوەو لە تەقەی سەتڵو گۆزە کە هێناویانە بۆ ئاو مێشك ئەزرنگێنێتەوە، بینی حەشاماتەکە کچێکیان پێش خۆیان داوە هێندە ناسکە نەبکەی نەبخۆی، تەماشای سادەیی گەردنی بکەی، مێوژە ڕشکە بخوات لە گەردنیەوە دیارە، کەسو کارەکەشی لە پشتیەوە بەقوڕپێوان دوای کەوتبوون. تیخ شوناس کسپە لەجەرگیەوە هات. کەباش تێی ڕوانی بینی ئەو کچەیە کە وێنەکەی بە دەریا بڕی هاوڕێیەتی . ئاگری تێبەربوو، پێشی خەڵکەکەی گەوتو هاواری کرد:

_((بیکەن بۆ خاتری خوا ڕاوەستن... حەیفە ئەم نازدارە دەرخواردی ئەو ئەژدیهایە بدەن، ڕاوەستن من ئەی کوژم )).

وتیان ((باوکم بڕۆ بەولاوە با ئیشی خۆمان بکەین و ئاومان دەست بکەوێت، تۆ حەقی ئەمەت چیە؟ )).

کە زانی حاڵ وایە بە پرتاو خۆی گەیاندە ئەژدیهاکە، هەر کەچاوی پێی کەوت ڕاست بووەوە بۆی هات. تیخ شوناس شمشێرەکەی بەقنجی لە بەردەمیدا گرتبوو، ئەژدیهاکە دەمی کردەوەو بەفیشکەیەك هەڵی لووشی... شمشێرەکەی دەستی شەقی کردو دوولەتی کردو لەوسەری هاتە دەرەوە... خوێن سەرچاوەکەی سور کردو بوو بەهەرا.کچەی بەستەزمان لەخۆشیاندا نەیزانی چی بکات، بەرەو ڕووی تیخ شوناس هات، هەردوو لەپی دەستی خوێناوی کردو کێشای بە پشتیداو پێی ووت:

_((بائەمە نیشانەی پاڵەوانیەتیەکەت بێت )).

شین و شەپۆڕ بوو بە شایی و زەماوەندو هەموو بەخۆشی گەڕانەوە. پادشا جارپدا کە کێ ئەژدیهاکەی کوشتوە بێت خەلات بکرێت. هەرکەسێ ئەهات کچەکە ئەیگێڕایە دواوەو بەباوکی ئەووت:

_((بابە ئەمە نیە، من خۆم نیشانەم کردوە!)).

کەس نەما نەیەت و نەیهێنن، بەڵام بەهەمان شێوە کچەکە بەنائومێدی ئەی گەڕاندنەوە دواوە ، لەدوایدا بەپادشایان ووت: ((پادشا کەس نەماوە، تەنها دوو غەریبەی میوانی پیرێژنێکی ئەو قەراغ شارە ماون، هەرنەوان نەهاتوون. کە هێنایانن کچەکە بینی شوێن پەنجەکانی بە پشتی تیخ شوناسەوەیەو هاواری کرد:

_((بابە ئەمەیەو ئەمەش نیشانەکەیەتی کەلێم داوە.)).

پادشا ناوچاوانی ماچ کردو پێی ووت:

_((کوڕی خۆشەویستم چیت ئەوێت بڵێ بتدەمێ )).

ووتی: ((پادشا خۆشی سەری تۆ )).

پادشا ووتی:(کورِم چیت ئەوێت داوا بکە)).

ووتی: ((پادشا خۆشی سەری تۆ)).

پادشا پێی ووت: ((کوڕی خۆم مەرجی پیاوان سێ جارە، چیت ئەوێت بڵێ)).

ووتی:پادشام گوڵێك لە باختدایە پێشکەش ئەم برایەمی بکە)).

ووتی:(وا پێشکەشم کردی!)).

پادشا ناوچاوانی ماچکردن، کچەکەیان لە دەریابڕ مارە کردو حەوت شەوو، حەوت ڕۆژ دایان تەقەی دەهۆڵو زوڕنا.

پاش حوت ڕۆژ تیخ شوناس بە دەریا بڕی ووت:

_((وامن مەرجی خۆمم بەجێ هێناو بە ناواتم گەیاندن، ئینجا نۆرەی خۆمە بچم بەدوای خۆشەویستەکەمدا)).

ووتی: ((منیش لەگەڵت دێم)).

_((نە , تۆلای خۆشەویستی خۆت دانیشەو جارجار یادم بکەرەوە )).

دۆعاخوازی لەهەموان کردو لێ یدا ڕۆیشت.

هەر ڕۆیشت .. هەر ڕۆیشت .. هەتا گەیشتە شارێك.

بینی لە هەموولایەك لەو وێنەیە هەڵواسراوە کە ئەو شەیدای بووە.

هەر بەجارێك سەری سوڕما. پیرە مێردێکی وەستانو لێ ی پرسی:

(( مامە گیان. بێ عەیبی نەبێ من خەڵکی ئەم شارەنیم , پرسیارێك ئەکەم وەرامم بدەرەوە )).

وۆتی: ((فەرموو )).

پێی ووت: ((من چەند وەختە عەودالّی خاوەنی ئەم وێنەیەم بەشوێنیدا ئەگەرێم, كەچی لەم شارەدا بەهەركوێیەكدا ئەڕوانم وێنەكەی هەڵواسراوە و ئەمە كێ یە؟)).

وەرامی دایەوە : ((كوڕی خۆم ئەمە{قەهری گەوهەر تاج}ی كچی پادشایە ..بەقسەی باوكی خۆت بكە لەكوێوە هاتوویت بڕۆرەوە .. جوانكەیت بانەفەوتێی )).

تیغ شوناس ئەوەندەی تر سەرسام بوو, لێ ی پرسی:

_((بۆچی؟)).

_(( ئائەو منارەیە ئەبینی؟.. ئەوە لەكەللە سەر دروست كراوە. چەندساڵە ئەم كچە مانی لەقسەكردن گرتووە ,

هەركەس دێت بۆخوازبێنی پادشا مەرجێكی بۆدا ئەنێت , ئەگەرتوانی بیهێنێتە قسە, وابۆخۆی, ئەگەر نەهاتە قسە والەسەری ئەدات... هەتا ئێستا كەس نەیتوانیوە بیهێنێتە قسە و لەسەری هەموویان دراوەو ئەو منارەیە لەكەللەكانیان دروست كراوە)).

تیغ شوناس ووتی((بەخوا باوكە گیان سەرێكەو هێناومە نایگێڕمەوە دواوە, یان دای ئەنێم یان قەهری گەوهەر تاجم بەنسیب ئەبێ !)).

ئەمەی ووتو لەكابرا جیابووەوە و. كەوتە گەڕان بەشاردا ... بینی كوڕە كەچەڵەیەك تووتی یەك ئەفرۆشێ, لەدڵی خۆیدا ووتی: (( با ئەم تویی یە بكڕم بۆ ئاودەنگی باشە )).

توتی یەكەی كڕی و لێ یدا ڕۆیشت. لەڕێگا توتی یەكە هاتەقسەو پێی ووت:

(( ئای برالە , ئەو كارەی بۆی هاتوی چەند ستەمە !)).

تیغ شوناس حەبەساو لێ ی پرسی: ((تۆ چوزانیت من بۆچی هاتووم؟)).

_(( ئـەزانم, بـەلام قـەی ناكـات مـادام لەدەسـت كەچـەڵە رزگـارت كـردم یارمـەتیت ئـەدەم, چوویت بەدڵمـدا, بـەیانی بچـۆ لای یـاوەری پادشـاو بڵـێ هاتووم بۆخوازبێنی قەهری گەوهەرتاج.

هەرچـی مـەرجێكی دانـا بڵـێ قبوڵمـە... دوایـی لەگـەڵتا دێـت بـۆ حـەرەمی كچەكە پـێش ئـەوەی بیگـەیتێ ئـەبینی دوو شمشـێر لـەم بـەرو لەوبـەری دەرگاكە بەیەكدا دێنو لەیەكتری ئەسوێن ،مەترسە بەبەینیانـدا بـڕۆ, مـن ئەو تەلیسمە ئەشكێنموئەیان وەستێنم. دوایـی ئەچنە ژورەوە، كچەكە لـە پشت حەوت پەردەوە دانیشتوەو دیارنیە. بەدزیەوە من بـەرەلا بكەئەچمە ژێر پەردەكانەوەو ئەوسا سلاوی لێ بكەو چیت ویست بیلێ)).

بەیانی چوو بۆ لای یاوەری پادشاو داواكارییەكەی پێوت: بردیانە خزمـەت پادشاو. پادشا پێ یووت:

_((كوڕم، وازلـەم بـیرە بهێنـەو بگـەڕێرەوە لای دایـكو بـاوكی خۆتوخۆت لەناو مەبە... قەهری گەوهەر تـاج بـەو هـەموو لاوانـە نەهاتـە قسـە ئێستا بەتۆش نایەتە قسە، لە كەلی شەیتان وەرە خواریو وازبهێنـە)).

وەلامی دایەوە:((قوربان، سەرێكەو هێناومە، نایبەمە دواوە)).

_((مادام وایە نامادەبە)).

لەگەڵیدا ڕۆیشتن بۆ حەرەمی كچەكە. لە بەردەرگا دووشیر ئەیاندا لەیەكو ئاگریـان ئـەكردەوە.كـەمێك وەسـتاو كـە قسـەی تووتییەكـەی بیركەوتـەوە ترسـی نـەماو بـەرەو ڕویـان ڕۆیشـت، هـەر كـەلیان نزیـك بـوەوە شـیرەكان وەستانو بە بەینیاندا تێپەڕی. پادشا پێ ی ووت:

((کـــوڕم بەمـــە مـــەنازە، ڕەنگـــە بەتەلیســـم توانیبێتـــت ئـــەم شـــێرانە بوەستێنیت، بەڵام قـەهری گەوهـەر تـاج نایەتـە قسەو ئێستاش نـەتوانیت بگەڕێیتەوەو خۆت لەناو مەبە !)).

وەڵامی دایەوە: ((گەورەم سەرێکە هێناومە،گەڕانەوەی نیە)).

کـــە چـــونە ژورەوە تاریـــك بـــوو، بەدزیـــەوە توتیەکـــەی لـــەگیرفانی دەرهێناوبـەرەڵای کـرد، ئـەویش لـەبن پەردەکانـەوە چـوە ئـەودیوو. خـۆی شاردەوە. تیخ شوناس هاواری کرد.

((سەلامون عەلەیکوم ئەی قەهری گەوهەر تاجی نازدار)).

توتییەکە بەدەنگێکی وەك دەنگی کچەکە وەڵامی دایەوە.

((وەی عەلەیکوموســەلام ئــەی یــاری بێوەفــا... ئەمــە چــەند ســاڵ مــن بەتەمای تۆ، ئەوە لە کوێیت... ناوا ئەبێوەفای خۆشەویستی؟))

قەهری گەوهەر تاج لەو دیو پەردەکانەوە حەپەسابووو، نـەیزانی چ باسـە، پادشا کە گوێی لە قسەکان بـوو بـە تورەییـەوە بـە یاوەرەکـانی ووت: ((ئـەم قەحبەیە بێننە دەرێو بیدەنێ، ئەوە بە تەمای ئەم پیاوە بووە بۆیە مـانی لە قسە گرتوەو ئەم هەموو تاوانانەشی پێ کردمو ئەم هەموو لاوانەشی پێ کوشتم)).

قەهری گەوهەر تاجیان هێنا. ئەویش ئەوەندە کە بەباوکی ووت:

_((بابە مەمدە بە شووئەو قسانە من نەبووم!)).

باوکی گوێی لێ نەگرتو دوورکەوتەوە.

ئەویش دووبارە مانی لە قسە گرتەوەو بێدەنگ بووەوە.

تیخ شوناس ماڵ ئاوایی لەپادشا کردو قەهری گەوهەر تاجی برد. بیری کردەوە: (( باشتر وایە بیبەمە جێگایەکی وا کەسی لێ نەبێت. بەڵکو بەتەنها تاقەتی بچێتو بێتە قسە.)).

هەررۆیشت هەررۆیشت هەتا گەیشتە زەریایەكودورگەیەكی بەدیکرد.لە لقی دار بەلەمێکی دروست کردو پەڕینەوە سەر دوورگەکە. لەوێ کۆشکێکی دروست کردو ماوەیەك پێکەوە بەبێدەنگی ژیان... بەیانیان تیخ شوناس ئەچووە دەرەوە بۆڕاوشکار، هەتا ئەهاتەوە قەهری گەوهەرتاج خواردنی بۆ ئامادە ئەکردو بە بێدەنگی بۆی دائەنا.

ڕۆژێ: لەو کاتەدا کە قەهری گەوهەر تاج لە گوێ زەریاکە ئەگەڕا قاچی هەڵەنگوتو تاکێك لە قاپقاپە زێڕنەکانی کەوتە ئاوەکەوە. بەرێکەوت ماسی یەك چاوی پێکەوتو قوتی دا ...

ماسی یەکی تر ئەوی قوت داو بەم جۆرە پێنج شەش ماسی یەکتریان قوت دا.

ماسی گرێك کەلەو خوارانەوە تۆڕەکەی خستە ئاوەوە بە ڕێکەوت ئەو ماسی یەی پێوە بووو، کە ئەو ماسی یە ئاوسەی بینی زۆری لا سەیر بووو. لە دڵی خۆیدا ووتی: ((وا پاشە ئەم ماسی یە سەیرە ببەم بۆ پادشا بەدیاری بەڵکو خەلاتێی باشم بکات. )).

ماسی یەکەی برد بۆ ماڵی پادشا. پادشاو کوڕەکەی دانیشتبوون کەماسی یەکەیان پاك کرد. کەسکیان هەڵدڕی بینیان ماسی یەکی تێدایە. ئەویشیان هەڵدڕی ماسی یەکی تریشی تێدابوو.. بەم جۆرە هەر سێکیان هەڵئەدڕینو ماسی یەکی تر دەر ئەکەوێت هەتا تاکە قاپقاپەکەیان بینی. کە کوڕی

پادشا چاوی پێ ی کەوتو ووتی: ((خوایەکەو نابێ بەدوو من خاوەنی ئەم قاپقاپەم نەوێت.)).

پادشا پێی ووت: کورم ئەوە تۆ شێت بووی؟ ئەزانی خاوەنی ئەم قاپقاپە دێوە درنجە, ئینسانە, چیە, وەکێ ئەزانێ لەکوێیە؟)).

پادشا زۆری ووتو کورەکەی نەیبیست. پادشا پیاو ماقوڵانی کۆکردەوە ئەگبیرێکی بۆ بکەن بەڵام کەس هیچی پێ نەکرا. ناچار هانان بردە بەر پیرێژنێکی جادووگەر کە یارمەتییان بدات. پادشا پێی ووت:(( ئەم کارەم بۆ جێبەجێ بکەیت بەسەنگی خۆت بە ئاڵتوون هەڵت ئەکێشمو ئەتدەمێ.)).

وەڵامی دایەوە:

(( ئەوەڵا پادشا, سەرێك بەلەتكو سەرێك بەپەتك هەڵ کێشە بەسمەوهیچی ترم ناوێت.)).

پادشا ووتی: دە سەربەلەتكو دەسەر بەپەتك هەڵت ئەکێشم!)).

پیرێژن خۆی کۆکردەوە, سواری چەرخوفەلەکەکەی بووو, بەئاسماندا بەرز بووەوەو دەستی کرد بەگەڕان ... هەر ڕۆیشت... هەر ڕۆیشت هەتا گەیشتە سەر دۆرگەکە.... کۆشکەکەی بینی لەدڵی خۆیدا ووتی: (( هەبێتو نەبێت لێرەدایە!)). نیشتەوەو چەرخو فەلەکەکەی شاردەوەوبەرەو کۆشکەکە ڕۆیشتولەدەرگایدا. قەهری گەوهەرتاج لەپەنجەرەکەیەوە سەیری کرد بەڵام لێ ی نەکردەوە. لەبەر دەرگاکە دانیشت هەتا تیخ شوناس هاتەوە. کەچاوی پێی کەوت دڵی خۆش بووو, لەدڵی خۆیدا ووتی: (( بەخوا باشە خوا ناردوویەتی, بەڵکو ئەم پیرێژنە بۆم بهێنێتە قسە)). بۆیە پێی‌ووت:

_((داپیرە ئەوە چی ئەکەیت لێرە؟)).

وەڵامی دایەوە داپیرە بەقوربانت بێت, کەشتیەکەمان نوقم بووە تەنها من ڕزگارم بوو, لەبەیانی زووەوە لەم بەردرگایەدا دانیشتووم کەس لێم ناکاتەوە, داڵدەم بدە هەتا خوا دەرویەکم لێ ئەکاتەوە....)).

تیخ شوناس بردیە ژوورەوە.

پیرێژن وەك ئاگری قودرەت لەماڵەکەدا هەڵئەسوڕاو هەموو شتێکی ئەکرد... کەتیخ شوناس ئەچووە دەرەوە قەهری گەوهەرتاجی دائەنا, قسەی خۆشی بۆ ئەکردو حیکایەتی بۆ ئەگێڕایەوە هەتا ڕۆژێك پێی ووت:

_(( خانمەکەم, خوا هەڵناگرێت والەم مێردە باشەت ئەکەیتو مانت لێ گرتووە, پیاوی وا لەجیهاندا نیەو حەیفەوای لێ ئەکەیت... قسەی لەگەڵدا بکەو ئیتر مان گرتن بەسە!...)).

ئەوەندەی بۆ ووتو چووە بن کلێشەیەوە قایلی کردو بەڵێنی لێ وەرگرت کە قسەی لەگەڵ بکات.

ئێوارەکەتیخ شوناس هاتەوە قەهری گەوهرتاج بە ڕووخۆشییەوە چوو بەپیریەوەو بەدەنگێکی پڕ لەخۆشەویستی یەوەبەخێرهاتنەوەی کردو لەلایەوە دانیشت.

تیخ شوناس سەرسام بووو, لەخۆشی دا خەریك بوو بفڕێت, هەستا ئەم لاو ئەو لای پیرێژنەکەی ماچ کردو پێی ووت:

_(( ئەی بەقوربانت بم داپیرە گیان, ئەوە هەمووی بەهۆی تۆوە هاتە قسەکردن... وەی بەقوربانت بم )).

ماوەیەك بەخۆشیو کامەرانی ژیان. ڕۆژێك داپیرە بەقەهری گەوهەر تاجی ووت: ( ئەرێ لەدەورت گەڕێم, ئەم ناوە سەیرە چیە مێردەکەت هەیەتی؟ تیخ شوناس یاعنی چی؟)).

وەڵامی دایەوە: ( بەخوا داپیرەگیان نازانم, من لەڕاستی دا هیچ شتێك دەربارەی نازانم).

( ئەی چۆن شووت پێکردوە؟)).

بەدرێژی باسەکەی بۆ گێڕایەوە. پیرێژن پێی ووت: ( ئەیەڕۆ کچەکەم نەمە بەڵکو دێو بێت, درنج بێت.... بۆچی لێ ی ناپرسیت بزانیت چیە؟ لێشی بپرسە بزانە ئەو ناوە بۆچی والێ نراوە)).

(باشە).

کەتیخ شوناس هاتەوەو شەوێ پاڵ کەوتن قەهری گەوهەر تاج لێ ی پرسی:

_( ئەوە بۆچی نەختێك دەربارەی ژیانی خۆتم بۆ ناگێڕیتەوە؟ چۆن لەدایك بوویت... چۆن گەورەبوویت....چۆن هاتیتە شارەکەی ئێمە.... بۆچی ناوت تیخ شوناسە؟)).

تیخ شوناس لەخۆشی ئەوەی وا بەڕوو خۆشییەوە قسەی لەگەڵدا ئەکرد لەنوکەوە هەمووی بۆ گێڕایەوەو پێش ئەوەی خەویان لێ بکەوێت باسی چەقۆکەشی بۆکرد ... چەقۆکەی دەرهێناو پیشانی دا, کەلەبەر پشتێنەکەی کردەوە وردە وردە هێزی نەماو نەیتوانی بیکاتەوە بەجێگەی خۆی‌داو خستیە ژێر سەرینەکەیەوە, وردە وردە بێ هۆش بووو, قەهری گەوهەرتاج خەوی لێ کەوت. پیرێژنەکە, کەلەودیو دەرگاکەوە خۆی گرتبوو گوێی لەهەموو قسەکان بووو, نهێنی چەقۆکەی زانی. بۆ بەیانی وەك ڕۆژان زوو لەخەو هەستا, خواردنی ئامادەکردو قەهری گەوهەرتاجی خەبەر کردەوە... زۆری پێ چوو تیخ شوناس هەر هەڵنەستا, قەهری گەوهەرتاج بەپیرێژنەکەی ووت :( داپیرە گیان تیخ شوناس نەخۆش نەبێت وا هەتا ئێستا نوستوە, ناچیت خەبەری کەیتەوە؟).

اپیره چاوەڕێی قسەیەکی وابوو و, بەپەلە چووە ژوورەکەی تیخ شوناس, دەستی کوتا بۆ بەر پشتێنو ژێر سەرینەکەیو کەچەقۆکەی دۆزییەوەلەپەنجەرەکەوە فڕێیدایە زەریاکەوەو هاواریکرد:

_( ئەی هاوار ماڵی وێرانم... ئەی هاوار فریام کەون). قەهری گەوهەرتاج بەپرتاوخۆی کردبەژووورداو بینی تیخ شوناس ها ئێستا مردوە, هاسەد ساڵە مردوە... دەستی کرد بەقژڕنینەوەو گریان.

کەباسی چەقۆکەی بیرکەوتەوە دەستی برد بۆبەر پشتێنەکەی نەمابوو . ڕوی کردە پیرێژنەکەو پێ ی ووت: ((داپیره چیت لەچەقۆکە کردووە, خۆ شەوێ پێی بوو !)) پیرێژن خۆی گێل کردو ووتی: ((داپیره لە دەورت گەڕێ

چەقۆی چی؟)).

_((ئەو چەقۆیەی بەبەر پشتێنەکەیەوەبوو؟)).

ئەم وتیو پیرێژن نەی بیستو هەر خۆی واپیشان ئەدا کەنازانێ باسی چی ئەکات . کچەکە دەستێکی کەوتە ئەم لاو دەستێکی کەوتەئەولا و دەستی کرد بەشیوەن کردنو لاواندنەوەو چل شەوو, چل ڕۆژ لەژور سەری گریا.

پیرێژنەکە هەر ئەی ویست کەپێی بسەلمێنێ کەتازە کارلەکار ترازاوەو مردووە ئەو بڕوای نەئەکردو نهێنی یەکی لەوباسەدا بەدی نەئەکرد بەتایبەتی کەچیرۆکی چەقۆکەی ئەزانیو چەقۆکەش نەمابوو.

پاش ئەمە هەموو ڕۆژێك پیرێژن ئەچوە بن کلێشەیەوە کەواز لە شیوەن کردن بهێنێو کەمێك بچن بەناو دوورگەکەدا بگەڕێنو پێی ئەووت: ((کچی شیرینم تۆجوانکەیت خوا هەڵناگرێ بەناحەق خۆت لەناو ئەبەیت, بەبەشی خوا شوکربەو بابینێژین !)).

وەرامی ئەدایەوە: (( داپیرە قسەی وام لەگەڵ مەکە , ئەمەهەمووی بەڵای تۆیە بەسەرمەوە ...)).

پیرێژنەکە هەروازی لێ نەئەهێناو لەدواییدا قایلی کرد کە بەیانیان گەشتێك بەناو دوورگەکەدا بکەن . ڕۆژێك بردیە ئەو شوێنەی چەرخو فەلەکەکەی لێ شاربووەوەو لەپڕ بەسەرسامی یەوە خۆی واپیشان دا گەشتێکی سەیری بەدی کردوەو

قیڕاندی:

_(( ئای ئەوە چیە؟)).

لێ ی چوە پێشەوەو چوە ناوی‌و قەهری گەوهەر تاجی بانگ کردو پێی ووت:

_ (( وەرە دانیشە بزانین ئەمە چی یە؟)).

کچەکە, کەنەیزانی ئەوە چی یە, چوە ناوی‌و لەتەنیشت پیرێژنەوە دانیشت, ئەویش دەسکەکەی باداو یەکسەر کەوتە جوڵەو بەئاسماندا بەرز بوەوە . قەهری گەوهەرتاج ترساو هاواری کرد: ((ئای داپیرە ئەوە چی بوو.... دامگرە ئەترسم !)) پیرێژن وەرامی دایەوە: ((داپیرە بەقوربانت بێت ناتوانم بی وەستێنمەوە )).

هەر ڕۆیشت ...هەر ڕۆیشت.. هەتاگەیشتە شاری کوڕی پادشاو لەوێ نیشتەوەو کچەکەی بردە ماڵی پادشاو تەسلیمی کرد . پیرێژنیان خەڵات کردو قەهری گەوهەرتاجیان بردە حەرەم . ئەوەندە هاتە قسەو ووتی:

_ (( من خاوەنم هەیە , چل ڕۆژ مۆڵەتم بدەن , ئەگەر پەیدانەبوو واهی نێوەم.)) ئەمەی ووتو دووبارە مانی لەقسەکردن گرتەوەو بەئامان زەمان نەهاتەوە قسە.

بابی نەوە سەرەوکاری ئەستێرە ژمێر.

ڕۆژێك دانیشتبوو تیغ شوناسی بیرکەوتەوەو لەدڵی خۆیدا ووتی: (( ئای من هاوڕێیەکی چەند بێ وەفام ... ئەو هەموو چاکەیەی لەگەڵدا کردم کەچی من هەربەجارێك ئەووم لەبیر چۆتەوە... باسەیرێکی ئەستێرەی بەختی بکەم بزانم گەشە یان کزە .)).

کەسەیری ئەستێرەی بەختی کرد بینی هێندە کزە بەحاڵ تروسکایی نەدات دەسبەجێ خۆی کۆکردەوە ماڵ ئاوایی لەژنەکەی کردو ووتی : (( تیغ شوناسی هاوڕێمان لەمەترسیدایە , نەچم بەڵکو فریای بکەوم )).

ژنەکەی هەرچەندە پێی ناخۆشبوو لێ ی دوور بکەوێتەوە بەلام ووتی:

_ (( زۆرباشە, هاوڕێی بەوەفا نابێ هاوڕێی باشی لەبیر بچێت ,بەخوات ئەسپێرم )).

هەرڕۆیشت .. هەر ڕۆیشت ... لەڕێگا لای دایە ئەوشارەی دەریا بڕی لێ بوو, باسەکەی تێگەیاندو پێی ووت:

_ ((ئێمە هەر زۆربێ سفەت بوینو ئەوبرایەمان بەجارێك وازلێ هێنا... ئێستا ڕۆژی یارمەتیەو ئەبێ فریای بکەوین )).

دەریا بڕیش ماڵ ئاوایی لە ژنەکەی کردو لەگەڵ ئەستێرە ژمێردا بەجوتە لێ یاندا ڕۆیشتن.

هەر ڕۆیشتن .. هەر ڕۆیشتن ... هەتا گەیشتنە دوورگەکەو لەدوورەوە کۆشکەکەیان بەدی کرد ئەستێرە ژمێر ووتی:

_ (( هەبێتو نەبیت لەم کۆشکەدایە , بەلام چۆن بیگەینێ؟)).

دەریابڕ وەرامی دایەوە:

_ (( ئەی لەبیرت چوە كەمن دەریابڕمو بەناو ئاودا نەتوانم بڕۆم؟ وەرە كۆڵم!)).

سواری پشتی خۆی كردو پەڕینە دۆرگەكەو چوونە كۆشكەكەوە. لەژورێكدا تیغ شوناسیان دۆزیەوە, بینیان بێ هۆشە بەلام نەمردوە. ئەم دیوو, ئەو دیویان كردچەقۆكەی پێوە نەبوو, ئەستێرە ژمێر ووتی: هەبێتو نەبێت پیلانێكیان پێ گێڕاوەو چەقۆكەیان وون كردوە, بابگەڕێین بەلكو بیدۆزینەوە)).

سێشەو, سێڕۆژ بەناو كۆشكەكەو دۆرگەكەدا گەڕان نەیان دۆزیەوە. دەریابڕ ووتی: ((هەبێتو نەبێت فڕێیان داوەتە ناو زەریاوە, ئەچم لەوێ بۆی ئەگەڕێم)).

چوە ناوەكەوەو هەرنەهاتە دەرێ . ئەستێرە ژمێر لەدڵی خۆی دا ووتی: (( ئای هاوار بەماڵم , بەخوا خنكاو ئەمیشم لەدەست دەرچوو )).لەم بیرانەدابوو دەریابڕ سەری دەرهێناو هاواری كرد : (( دۆزیمەوە!)).

بەپەلە چەقۆكەیان كرد بەبەر پشتێنەكەی تیغ شوناسدا, یەك دوجار پژمیو هاتەوە هۆش خۆی. كەهاوڕێكانی بەدی كرد باوەشی پیاداگردنو ماچی كردنو هاواری كرد:

_ (( داپیرە !... قەهری گەوهەرتاج!.... برسیانە خواردنمان بۆ بێنن)).

پێیان ووت: (( ئەوەتۆ ئەڵێ ی چی؟ داپیرەی چیو قەهری گەوهەرتاجی چیو تەڕماشی چی؟... خوائەزانێ چەند وەختە بێ هۆشیت , هەستە فریای خۆت بكەوە بابڕۆین )).

بەدرێژی بەسەرهاتەكەیان بۆ گێڕایەوە ئەویش بەكورتی بەسەرهاتی خۆی بۆباس كردنوبێ ئەوەی وەخت بەفیڕۆبدەن ڕۆیشتن.

بێ وەستان هەر ڕۆیشتن ... هەر ڕۆیشتن ... هەتا گەیشتنە شارێكو چونە خانێـك. ژنێكـی دراوسـێ ی خانەكـە خزمــەتی ئـەكردنو خـواردنی بـۆ ئـەهێنان . هـەموو جارێـك لیرەیـەكیان بـۆ ئەخستە قاپـە بەتاڵەكانـەوە و ئەیان دایە. ڕۆژێك پێی ووتن: (( لەدەورتان گەڕێم,ئێوە هەمو ڕۆژێك ئـەم لیرەیە بۆچی ئەدەن بەمن؟)).

ووتیان: (( داپیرە , ژنێكیان ڕفاندوین لامـان وایـە هێناویانەتـە ئـەم شـارە, ئینجا دەنگوباسی ئەمە چی ئەزانیت

پێمان بڵێ )).

ووتی (( بەخوا لەدەورتان گەڕێم ژنێكیان هێناوەو ئەیانەوێ لەگوڕی پاشای مـارە بكـەن, ئـەویش وتویـەتی خـاوەنم هەیـەو مـۆڵەتی چـل ڕۆژی لێ وەر گرتوونو هەر ئەم شەوی ماوە, ئینجا نازانم ئەوەیە كە ئێوە بۆی ئەگـەڕێن یان

یەكێكی ترە!)).

لێ یان پرسی ((نازانیت ناوی چی یە؟)).

_ (( نەبەخوا كوڕەكانم , چونكە لـەو ڕۆژەوە كـە هێناویانـە مـانی لەقسـە كردن گرتودو وەرامی كەس ناداتەوە)).

هاواریان كرد : خۆیەتی !)).

دوایی تیغ شوناس پێی ووت: (( داپیرە گیان , هـا ئـەوە مستێك لـیرەی تـر, ئەتوانیت بچیت بۆلای؟))..

ووتی: (( لەدەورتان گەڕێم ئەی چۆن ناتوانم, من دایەنی كوڕەكـەیان بـومو وەك ماڵیخۆم وایە ,هەركاتێ

بمەوێ ئەچم )).

تیغ شوناس پێی ووت : (( دەگەواتە هەر ئێستا بچۆ پێی بڵێ کەخاوەنی هاتووەو بزانە ئەڵێ چی ... ئەم ئەموستیلەیەشی بۆناونیشان بدەرێ !)).

ژنەکە خۆی گەیاندە ماڵی پاشا ,بینی شایی‌و زەماوەندەو خەریکی ڕازاندنەوەی ژنەکەن. دڕی بەخەڵکەکەداو خۆی گەیاندێو چرپاندی بەگوێیدا: ((کچەکەم پیرۆز بێت‌و مژدانەم بدەرێ...)).

ئەی هێشت قسەکەی تەواو بکات کێشای بەدەمی دا چونکە وای زانی پیرۆز بایی شووکردنەکەی لێ ئەکات .

پیرێژن پێ ی ووت : (( کچی خۆم , بۆچی لێم ئەدەیت, ئەڵێم پیرۆز بێت‌و مژدەبێت خاوەنت هاتووە!)).

گەوای ووت قەهری گەوهەرتاج باوەشی پێدا کردو ئەم لاولای ماچ کردو ووتی ((لێم ببورە داپیرە گیان نەمزانی ....

بەڵام چۆن بزانم ڕاست ئەکەیت؟...... کێ پێی ووتی؟)).

ژنەکە ئەموستیلەکەی دایە . قەهری گەوهەرتاج ئەموستیلەکەی ماچ کردو پێی ووت:

_((داپیرەگیان, هەر ئێستا بچۆرەوە لای‌و پێی بڵێ کەتەنها ئەم شەوم ماوە, ئەگەر هەتا نیوە شەو فریام نەکەوێت خۆم دەرمان خوار ئەکەم )).

گەڕایەوە خانەکەو بەدرێژی بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕانەوە. نزیکی نیوە شەو خۆیان ئامادەکردو بەرەو کۆشکی پادشا ڕۆیشتن ... پاسەوانەکان مەستی ئاهەنگ‌و زەماوەندی ڕۆژبون‌و خەویان لێ کەوتبوو بەشێنەیی هەموویانیان دەم کوت کردو ئەوی بزێوی کرد سەریان بڕی‌و چونە حەرەم.

بەو ناونیشانەی ژنەکە بۆی هەڵدابوون زوری هەهری گەوهەرتاجیان دۆزیەوەو چونەژوو رەوەو , بینیان پیاڵەیەك ژەهری بەدەستەوەیە

بردوویەتی بۆدەمی خەریکە ئەیخواتەوە تیغ شوناس بەقەڵە بازێك گەیشتە سەری‌و دەستێکی دا بەپیاڵەکەدا خستی‌و شکاندی. باوەشیان کرد بەیەکداو قەهری گەوهەرتاج ووتی:

_ (( بابڕۆین‌و نەوەستین, نەك پاسەوانەکان پێمان بزانن)).

_ (( مەترسە, هەموویانمان چارەکردوە. تۆکێ ئەمەی پێ کردیت؟)).

_ (( ئەو داپیرەی ڕامان گرتبوو)).

ژووری پیرێژنەکەیان دۆزیەوەو, دەمیان بەست‌و خستیانە پاشکۆی خۆیان‌و شاریان بەجێ هێشت.

کەلەشار دەرچوون پیرێژنەکەیان داگرت‌و هەرقاچێکیان بەست بەئەسپێکەوە یەکێك بەلای ڕاست داو ئەویتریان بەلای چەپدا تاوداو هەڵیان قڵیشان

تیغ شوناس بەهاوڕێکانی ووت:

_ (( بەبێ دواکەوتن بڕۆین, باهەرکەستان ژنی خۆی هەلگرێت‌و بەرەو ووڵاتی خۆی بڕوات نەك توشی بەلایەکی تریش ببین . دەریابڕیان گەیاندە شاری ژنەکەی, داوایان لەپادشا کرد کەڕێگەی بدات ژنەکەی بەرێت, پاشا پێی ووت:

_ (( ژنی خۆیەتی فەرمو بابیبات )).

خەڵاتێکی باشی کردن‌و کەل‌و پەلی پێویستی بۆبارکردن‌و بەرێی کردن.

چون بۆشاری ژنەکەی ئەستێرە ژمێریش, بەهەمان شێوەی ماڵ ئاوایان لەپادشا کردو ژنەکەی هەلگرت‌و بەخەڵاتەوە کەوتنە رێ. لەدواییدا دۆعاخوازییان لەیەکتری کردو هەرکەسە بەرەو ووڵاتی خۆی ڕۆیشت. بەڵێنیشیان بەیەکدا کە

ناوبەناو یادی یەکتری بکەنەوە.

کەتیغ شوناس گەشتەوەماڵ بینی دایکو باوکی لەتاودا کوێر بونو لەکونجێکدا دانیشتوونو تەرکی دنیایان کردوە .

هەرلەدوورەوە بەبۆن زانیان کوڕەکەیان گەڕاوەتەوەو لەخۆشیدا هەردوچاویان کاك بوەوە.

بەمجۆرە بەیەك شادو شوکربونەوە.......

**منیش هاتمەوە هیچیان نەدامێ...!.**

# کوڕەکەچەڵە

هەبوو...نەبوو... کەس لەخواگەورەتر نەبوو.... کەس لەبەندەی خراپ ڕوو ڕەشترنەبوو, پیرێژنێك هەبوو کوڕێکی کەچەڵی بێ کاری هەبوو. هیچ نیشێکی نەئەکرد . دایکی بەهەزار کوێرەوەریی‌و نان کردن‌و جل شتن بەخێوی ئەکردو ئەگەر شتێکی پاشەکەوت بکردایە کەچەڵە لێ ی ئەدزی‌و ئەی کرد بەقومارو لەناوی ئەبرد . دایکی هەرهەوڵێکی لەگەڵدا ئەدا کەئیشێك بکات‌و پارویەك نان پەیدا بکات کەڵکی نەبوو.

ڕۆژێك ،وەك جاران , پارەکەی لێ دزی‌و لەدەروێشێك مارێك‌و سیمرخێك‌و پشیلەیەکی کڕی‌و هێنانیەماڵەوە. کەدایکی چاوی پێی کەوت تێلایەکی لێ هەلگرت‌و نەڕاندی بەسەریداو پێی ووت:

((هەتیوە بێکارە کەچەڵە!, سەرەڕای ئەوەی بووی بەبەلا بەسەرمەوەو پارەو پولت پێ نەهێشتووم, ئینجا نۆرەی ئەم شتانەیە بیانهێنیتە ماڵەوە؟ ودڵلاهی هەر ئێستا فرێیان نەدەیت نایەیتەوە ئەم ماڵە)).

بردنیەوە بۆبازاڕ کەبیان فرۆشێتەوە بەلام کەس لێی نەکڕی‌و ناچار چوو لەودەشتە فرێیان بات. سیمرخەکە پێی ووت: ((بەرەلام بکە بەکەلکت

دێــم... بــەڵام پــەڕێکم لێهەڵکێشــە هــەر کاتێــك کەوتیتــە تەنگانــەوە هەڵیکرۆزێنە فریات نەکەوم)).

پەڕێکی لێهەڵ کێشاو ئەوی بەرەڵاکرد.

کەویستی پشیلەکە بەرەڵابکات پێ ی ووت:

_((خــەیاڵت خــاوە, بــەخوا بــەرەڵام بکــەیت هەردووچــاوت هەڵئــەکۆڵم!. هەروەها بشهێڵیت برسیم بێت چاوت هەڵئەکەنم!)).

بەخۆی ووت: (( دەبخۆدەی, ئەوەدەمردتبێت, خۆت تووشی چی کرد!)).

ئینجــا ویســتی مارەکــە بــەرەڵابکات, مارەکــە هاتــە زمــانو پــێ ی ووت: (( نەکەیت بەردلام بکـەیت, بـەخوا واپێتـەوە ئـەدەم تـووکی سـەرت بابیبـا ... ئەبێ بم بەیتەوە بۆلای دایكو باوکم!))

کەوتە پاڕانەوەو بەمارەکەی ووت:

_(( بیکە بۆخاتری خوا بـەڵام لێ لادە, مـن چۆنت بگەیەنمـەوە لای دایـكو باوکت؟... چووزانم لەکوێن؟)).

مارەکە پێ ی ووت:

_((مـن کـوڕی شـای مـارانم. بـەرم بـدەو دوام کـەوە بۆپارێزگـاریمو هـەقت نەبێ, هەتا ئەگەینە شاری مارانو تەسلیمی باوکم ئەکەیت)).

بەریداو دوای کەوت.

هەر ڕۆیشت... هەر ڕۆیشت هەتا گەیشتە شاری ماران.

کەچەڵە بەجارێك زارە ترەك بووو هێزی نەژنۆی نەما.

پەنا بەخوا زدوی لەبەر مـار دیارنـەبوو خـەریك بـوو بـەرەو دواوە ڕابکـات, بەڵام ماردکە پێ ی ووت:

_(( بەسەرياندا برۆو ترست نەبێ, لەبەر ئەوەی منت لەگەڵدام هيچيان حەديان نيە پێتەوە بدەن)).

بەسەر پاندا ڕۆيشتو زۆری لێ پانکردنەوە هەتا گەيشتنە لای شای ماران. بينيان شينو شەپۆڕيانە. کەچاوی بەکەچەڵەکەوت سەری بەرزکردەوەو ويستی پێوەی بدات مارەکە هاواری کرد: (( نەکەيت بابەگيان!)).

کەباوکی چاوی بەمارەکە کەوت تێوەی ئالاو ماچی کردو ووتی: (( ئای ڕۆڵەی شيرينم ئەمە تۆی؟ لەوەتەی ڕۆيشتوويت شيوەنو گريانمانە, ئەوە لەکوێ بوويت؟)).

((بابەگيان, لێم ببورە سەرکێشيم کرد. بەقسەی تۆم نەکردو لێرە دوورکەوتمەوە, لەسەر کانیو ئاوێك دەروێشێك گرتمیو لەوساوە يارِيم پێ ئەکاتو پيشانی خەڵکيم ئەدات هەتا ئەم کوڕە ڕزگاری کردمو هێناميەوە بۆنێرە... ئەبێ خەڵاتێکی باشی بکەيت)).

باوکی سوپاسی کەچەڵەی کردو هاواری کرد:

(( ئا قووتووەکەی بدەنێو بەڕێی بکەن!)).

قوتوويکيان دايە ئەوەندەی قووتووە جگەرەيەك ئەبوو, کەديوێکی ئاوێنەبوو, بەڕێيان کرد هەتا لەسنوری ماران دەرچوو.

هەر ڕۆيشت... هەر ڕۆيشت... پاش ماوەيەك پشيلەکە پێی ووت:

(( برسيمە... شتێکم بۆ پەيدا نەکەيت بيخۆم چاوت هەڵئەکەنم !)).

کەچەڵە کەوتە پاڕانەوەو پێی ووت:

((تۆزێکم لێ ڕاوەستە بەڵکو خواشتێك بنێرێ!)).

ماوەيەکی تر ڕۆيشتن دووبارە پشيلەکە داوای خواردنی کردو ووتی:

((ئيتر خۆم پێ ناگيرێت, هەردوو چاووت هەر ئێستا هەڵ ئەکۆڵم )).

کەچەڵەکە لەترسا دەستی برد بۆبەر باخەڵی بەنیازی ئەوەی بەڵکو شتێکی تێدا بێو بیداتێ, کەدەستی بەرقووتووەکە کەوت دەری هێناو ووتی:

_(( لە ... دایکی شای ماران بەم, لەباتی هەمووشتێك ئەمەی دامێ, من چی لەقووتوو بکەم؟)).

ئەمەی ووتو هەتا هێزی تێدابوو تووڕی هەڵدا . کەکەوتە سەر زەویو کرایەوە دوو قوولی لێ هاتە دەرەوەو, هاتنە بەردەمی, کڕنۆشیان بۆ بردوو پێ یان ووت:

_(( فەرمووگەورەمان ... فەرمانت بەچیە ؟)).

کەچەڵە حەپەساو پشیلەکە فریای کەوتو پێی ووت: ((بڵێ برسیمە !)).

کەچەڵە پێی ووتن: (( برسیمە !)).

هەرکەقسەکەی تەواوکرد سینیەك لەبەردەمی دانرا هەرچی دڵ حەزی لێبکات لەسەری بوو. خێراچوو قووتووەکەی هەڵگرتەوەو ماچی کردوو خستیەوە باخەڵیو ووتی:

_(( بەخوا شتی چاکە!)).

نانیان خواردو لێیاندا ڕۆیشتن.

دووبارە قوتووەکەی دابەیەکداو . دوو قوولەکە پەیدا بوونەوەو, کڕنۆشیان بۆ بردوو ووتیان:

_(( فەرمووگەورەمان ... فەرمانت بەچیە ؟)).

_(( دەستێك جلو ئەسپێکی نایابم ئەوێ )).

کەسەیری خۆی کرد دەستێك جلی پادشایانەی لەبەردابوو, و ئەسپەشێ یەکی نایابی لەژێردابوو, لەگەڵ پشیلەکەدا لێیاندا ڕۆیشتن !.

گەیشتنەوە شارەکەی خۆیانو چوونە بەر ماڵە کەلاوەکەی خۆیانو. لەدەرگایدا. کەدایکی دەرگاکەی لێ کردەوە نەیناسیەوەو لای سەیربوو پیاوێکی وا پۆشتەو پەرداخ لەو نزیك بێتەوە. کەچەڵە ووتی:

((داپیرەگیان میوان ڕائەگرن؟ )).

ووتی: (میوان بەمن ڕازیبێت ماڵی خۆیەتیو بەسەرچاوان بێت).

کەچووە ژوورەوەو لەسەر حەسیرە شڕەکە دانیشت لەپڕووتی:

_(( دایە، نامناسیتەوە؟)).

کەبەووردی تێی ڕوانیو ناسیەوە پێی ووت:

_(( هەتیوە بەد فەساڵە ئەمانەت لەکوێ دزیوە؟)).

_(( دایە ئەم دزیون ... من ئێستا پیاوێکی ترم... ئەبێ بەیانی بچیت خوازبێنی کچی پادشام بۆ بکەیت)).

دایکی حەپەساو دووسێ چرپە چرپی کردوو ووتی:

_(( وەی موری موحەمەدی شەریف، ئەوە شێت بووی ڕۆڵە تۆو کچی پادشا کوجا مەرحەبا!. هەستە پارویەك نان پەیدا بکە لەوە باشترە)).

(( دایە گیان ئەسپەکەم ئاوبدە ئێستا ئەچم نانیشت بۆ پەیدا ئەکەم )).

کەدایکی چووە دەرەوە ئەسپەکەی ئاوبدات قووتووەکەی دابەیەکداو، دووقوولەکان هاتنە دەرێو ووتیان:

(( فەرموو گەورەمان...)).

((برسیمانە!)).

چاوتروکاندنێکی پێ نەچوو سینیەکی ڕازاوە لەبەردەمی دانرا. کەدایکی هاتەژورەوە بڕوای نەکردو وای زانی خەیاڵە.

کەچەڵە ووتی :(( دایە ئەوە بۆچی واحەپەساوی؟ نەتوت نان پەیدا بکە؟ ئەوەتا , دەوەرە بیخۆ)).

نانیان خوارد. دوایی کەچەڵە ووتی:

_ (( دایە, بەیانی بچۆ خوازبێنی کچی پادشام بۆبکە !)).

دایکی وەڵامی دایەوە : (( وەی موری محەممەدی شەریف!: ئەوە دووبارە شێت بویتەوە؟ کچی پادشای چیو تەڕەماشی چی, بێ دەنگ بە دارو دیوار گوێی هەیە بزانن قسەی وائەکەیت چوارمێخەمان ئەکێشن )).

ووتی: (( دایە بەڕاستمە, بەخوا هەر ئەبێ بچیت )).

بەیانی بەزۆر ناردی بۆماڵی پادشا . کارەکەرێك وای زانی هاتوە بۆسواڵکردن, خواردنی بۆبردو دەری کرد...

کەچەڵە زانی باسەکەی نەدرکاندوە توڕەبوو, بۆسبەینێ دووبارە ناردیەوە. ئەم جارە کەچوو بۆماڵی پادشا لەو جێگایە دانیشت کەخوازبێنی کەرانی تیا دائەنیشێت, هاتن تێریان لێ داو .دووبارە دەریان کردەوە. کەبۆجاری سێهەم چوەوە ناچار بردیانە لای پادشاو داواکاریەکەی پێ ڕاگەیاند.

پادشا ووتی:

_ (( من سێ مەرجم هەیە , هەرکەسێ بەجێیان بهێنێ کچەکەمی ئەدەمێ, بەجێیان نەهێنێ لەسەری ئەدەم )).

داپیرە ووتی: (( قوربان مەرجەکانت چین؟)).

پادشا ووتی: (( یەکەم ئەبێ هەتا بەیانی لەخەو هەڵ ئەستم کۆشکێکم بۆدروست بکەن خشتێکی لەزیوو, خشتێکی لەئاڵتون بێت. دووەم : حەوت مزگەوتی ڕازاوەم بۆ دروست بکەن کەبەیانی لەدەنگی بانگ خەبەرم

بێتەوە. سێهەم:منارەیەکی ئەوەندە بەرزیشم بۆ دروست بکەن سەری بگاتە کەشکەلانی فەلەك )).

کەئەم مەرجانەشی ووت مەبەستی نەدانی کچەکەی بوو. داپیرە هاتەوە ماڵەوەو ئەم مەرجەسەیرانەی بەکەچەڵ ووت.

کەچەڵەپێی ووت:

_ (( ئاسانە! ئەم شەو بنو, هەتاسبەینێ خواکەریمە!)).

دایکی چەپۆکێکی پێدا کێشاو ووتی:

_ (( عەمرت نەمێنێ, لەباتی کۆشكو مزگەوت ژورێك بۆخۆمان دروست بکەیت باشتر نیە؟)).

_ (( دایە نۆرەی ئەویش دێت )).

کەدایکی چووبۆ ناو هێنان کەچەڵە قوتوەکەی دابەیەکدا. دووقولەکە پەیدابونەوەو وتیان:

((گەورەمان ئەمە لەدەسەڵاتی ئێمەدا نیە, ئەبێ پرس بکەین )).

ئەمەیان ووتو وون بون. زۆری پێ نەچوو پەیدا بونەوەو ووتیان:

_ (( گەورەمان خەمت نەبێ شەوێ هەرچی دێو درنجو جنۆکەی پشت قولەی قاف دێنو کارەکەت بەجی دێنن)).

نیوەشەو دێوو درنجو جنۆکە دەستیان کرد بەکارکردنو تەواویان کرد. بەیانی پادشا لەدەنگی بانگ دانی سەرمنارەکەو مزگەوتەکان خەبەری بوەوە, دای بەسەرخۆیداو ووتی:

_ (( دەك هاوار بەماڵم کچەکەم لەدەست چوو!)).

کەچەڵە بینی کارەکان بەجێ هێنراون قوتوەکەی دابەیەکدا, دووقولەکە پەیدابوونەوەو ووتیان گەورەمان فەرموو.

پێی ووتن: (( ئەمەوێت لەجێگای ئەم کەلاوە شڕەی خۆمان کۆشکێکم بۆدروست بکەن لەکۆشکی پاشا خۆشتر بێت!)).

ئەوەندەی پێ نەچوو کۆشکێکیان بۆدروست کرد کۆشکی پاشا لەشاباشی دا ئەدرا. پادشا ناچاربوو بەڵێنەکەی بەجێ هێناو کچەکەی لێ مارە کردو گواستیەوەو حەوت شەوو، حەوت ڕۆژ درا لەتەقەی دەهۆڵو زوڕناو ماوەیەکی زۆربەخۆشیو کامەرانی ژیان.

ڕۆژێک لەگەڵ پشیلەکەدا چووبۆگەڕانو ڕاو شکارو زۆرلەشار دوورکەوتنەوە. لەسەرکانی یەک کچێکی دی مەلەی ئەکرد.ئەوەندە نازدارو جوان بوو حەزی لێ کردوو بەتیری ئەشقی گرفتاربوو.

قوتوەکەی دابەیەکدا، کەدووقولەکە پەیدابوو پێی ووتن ((ئەمەوێ ئەم کچەم بەتەختو بەختەوە بۆبەرنە ماڵی خۆمان!))کەگەڕایەوە کچەکە لەماڵەوە بوو. مارەی کردو چەندساڵێک پێکەوە ژیان. ژنی یەکەم کچێکی بوو ژنی دووەم دووکوڕی بوو.

ژنی دووەم کچی پادشای وڵاتێکی دووربوو. کەزانی کچەکەی ئەماوە ڕابەری بەهەرچوارلای جیهاندا بڵاو کردەوە بەڵکو بۆی بدۆزنەوە بەڵام کەس شوێنەواری پێ هەڵ نەگیرا. ناچار لەدوایی دا جاڕیدا هەرکەس بتوانێ کچەکەی بۆ بهێنێتەوە تەختی پادشایی بۆ بەجێدێڵێ !، پیرێژنێکی سەر ئاسنینە هاتو ووتی:

_ (( پادشام من بۆت ئەدۆزمەوە، بەڵام تەختی پادشاییم ناوێ، ئەمەوێ سەرێك بەلەتك سەرێك بەپەتك     هەڵم کێشیت !)).

پادشا پێی ووت: (( دەسەربەلەتکو دەسەر بەپەتک هەڵت ئەکێشم، هەربەو مەرجەی کچەکەم بۆبدۆزیتەوە!)). پیرێژنەکە ڕملی هەڵداو شاری

کەچەڵەی دۆزییەوە کەناوی خۆی نابوو ئەحمەد پادشا. کەوتەڕێو پاش ماوەیەك گەیشتنێو ماڵەکەی دۆزیەوەو لەبەرکۆشکەکەیان وەستا. کەلەدەرگای داو کچەکە لەپەنجەرەکەوە بەدیکرد زانی خەڵکی وڵاتی خۆیانەو بۆکاری باش نەهاتوە لەبەر ئەوە دەرگاکەیان لێ نەکردەوە. ئەویش لەبەردەرگاکە هەڵتوتا. کەئەحمەد هاتەوە پیرێژنەکە زۆر پاڕایەوە داڵدەی بدەن چونکە بێکەسەو خەریکە لەبرساندا بمرێت. ئەحمەد بەزەیی پیاداهاتەوەو بردیە ژوورەوە.

ماوەیەکی پێچوو ئەوەندە خۆی خۆشەویست کرد هەموو کاروباری ماڵی گرتەدەستو دڵی لەهەمویان سەند.

ڕۆژێك ئەحمەد لەگەڵ پشیلەکەیدا وەك ڕۆژانی ترچوو بۆڕاوو بەرێکەوت قوتوەکەی لەماڵەوە لێ بەجێما .کەپیرێژنەکە جێگاکەی کۆکردەوەو چاوی پێی کەوت بەلایەوە شتێکی جوان بوو کردیەوە بۆ ئەوەی بزانێ ناوەکەی چۆنەچی تێدایە هەرکەکردیەوە دووقولەکە پەیدابوونو بەتووڕەییەوە پێیان ووت:

((ها, پیرێژنە قوڵتڕە تۆچیت ئەوێ؟)).

پیرێژنەکە کەئەمەی بینی دڵی خۆش بوو, ووتی:

((کچی پادشاکەمان بەتەختو بەختەوە ببەنەوە شوێنی خۆی. کچی پادشاکەی ئێرەش ببەنەوە ماڵی باوکی, ئەحمەدیش بخەنەوە دۆخی جارانی!)).

ئەوەندەی بڵێ ی یەكو دوو ئەمانە هەمووی بەجێ هێنران لەجێگای کۆشکەکە کەلاوە شرەکە پەیدا بوەوەو ئەحمەد بوەوە بەکەچەڵەکەی جاران. کەخۆی لەجلە شڕەکاندا بینی دای بەسەری خۆیداو بەهەڵەداوان

گەڕایـەوە, بینـی دایکیشـی بەجلـە شـڕەکانیەوە لەکەلاوەکـەدا دانیشـتوەو شـیوەن ئـەکات. کەچـەڵە هـاواری بـردە بـەر پشـیلەکە بـەڵكو چـارێکی بۆبۆزێتەوە. پشیلەکە پـێی ووت: (( یـەك چارت هەیـە, نـەهێڵیت برسیم ببێت , ئەگینا چاوت هەڵئەکۆڵم !)).

لێ ی توڕەبـــووەو. ووتـــی ((بۆچـــی ئەوەنـــدە ســـپڵەیت؟... چـــارێك بدۆزەردوە...)).

پشیلەکە ووتی: (( بابڕۆین بگەڕێین بەشوێنیدا بەڵکو بیدۆزینەوە....)).

هـەر ڕۆیشـتن .... هـەر ڕۆیشـتن هـەتا گەیشـتنە شـارێك. لەپەنجەرەیەکـدا ژنەکەی بـەدی کـرد, بـەڵام ڕووی نـەهات بـەو جلـە شـڕانەوە خـۆی ئاشـکرا بکات. ئێوارەیە لەبرساندا لەدەرگای ماڵێکی دا بـەڵکوخواردنێکی بـدەنێ. لێ یان کردەوەو بردیانە ژورەوەو هەموو لەپشیلەکەی کۆبونـەوە چـونکە شـتی وایان نەدی بوو. کەنان دانرا دووکەس دەستیان دایە تێلاو بەپێوە وەستان. کەچەڵە زۆر ترساو ووتی:

ـ (( بۆچی عادەتی ئێوە وایە میوان تێلا تڕێن ئەکەن؟))

ووتیـان: (( حـەدمان چـی یـە میـوان گـەورەی ئێمەیـە... ئەوانـە مشـك ئەکوژن!)).

کەچەڵە زۆر سەری سوڕما . زۆری پێ نەچوو لەهەموولایەکەوە مشك وەکم گەڵای دار باریو هەراسانیان کردن.

فریانەئەکـە تـن بیـان کـوژن و لەگـەڵ ئەوانـدا لەسـەر مێزەکـە شـتیان ئـەخواردو بەهەرچـوارلادا فڕکـەیان ئـەهات. کەچـەڵە کەئەمـەی بینـی پشیلەکەی تێبەردانو ئەوەندەی پێ نەچوو ئەوەی کوشتیو ئەوەی نەکوژرا ڕایان کردو خۆیان شاردەوە .

خەڵکەکە حەبەسانو داوایان لێ کرد پشیلەکەیان پێ بفرۆشێت , پشیلەکە پێی ووت: ((بەخوا بمفرۆشیت چاووت هەڵ ئەکەنم !)).

لەولاوە مشکەکان کەزانیان ئەم بەڵایەیان توش بووە لەناو خۆیاندا کە وتنە گفتو گۆ بەڵكو چارێك بدۆزنەوەو . هاواریان بردە لای شای مشکان ڕزگاریان بکات. لەئەنجامدا یەکێکیان ناردە لای کەچەڵە پێی بڵێ چی ئەوێت ئامادەن بەو مەرجەی پشیلەکەی بگەڕێتەوەو وازیان لێ بهێنێ. ئەویش وەڵامی دایەوە: (( قوتویەکی لەم حاڵەو لەم ڕەنگەم لێ وون بوە, بۆم ئەدۆزنەوە باشە, بۆم نادۆزنەوە تاقتان ناهێڵم !)).

مشك بەهەرچوارلادا بڵاوبوونەوە, هەرچی قوتویەك لەشاردا هەبوو هەموویان بۆ هێنا, قوتویان لەدوکانی وردەواڵە فرۆشدا نەهێشت, بەڵام هیچیان نەبوو, کونو قوژبنی شارنەما نەگەڕێن بێ سودبوو. لەدواییدا دوانیان لەماڵێك بینیان پیرێژنێك پاڵی لێ داوەتەوە, جامی جەم شید لەبەردەمیدایە سەیری ئەکاتو ئەشئە ئەگرێت, قوتویەکیان بینی بەزری یەکی زێری باریك بەلوتە سمراوەکەیدا هەڵواسرابوو یەکەمیان بەدوهەمیانی ووت:

_ (( بەڵكو ئەمەبێت؟)).

_ (( ئینجا چۆنی لێ بسەنینەوە ؟)).

_ (( من ئێستا چاری ئەکەم )),

چوو کلکی تەڕکردو لەوردە توتنی هەڵکێشاو بەدزیەوە کردی بەلوتی پیرێژنەکەدا, ئەوەندە پژمیو ئاو بەلوتی دا هاتەخوارەوە و ئاگای لەقوتووەکەنەما هەتا لەدوایدا لەتاوا ئەوەندە بەقایم لوتی سڕی. زریزەکە

پچڕاو قوتوەکـە کەوتـە خـوارەوە, مشـکەکە پـڕی پێـدا کـردو فڕانـدی و بردیەوە بۆ کەچەڵە وەپیٚ ووت:

_ (( ئەمەیە ؟)).

ئەحمـەد ئەوەنـدەی نـەمابوو لەخۆشـیدا پەرکـەم بگرێـت, قوتودکـەی مـاچ کردو ووتی:

_ (( دەی کەواتە بەڵاکەت بگردوەو ئیتر تێمانی بەرمەدە !)).

پشـیلەکەی گرتــەوەو ڕۆشــتن. لـەڕێگا قوتودکـەی دابەیەکـدا دووقولەکـە ددرگەوتن‌و ووتیان:

_ (( ئەوەبۆچـی ئێمـەت دایـە دەسـت ئـەو پیرێژنـە فـوڵتڕە؟ ئەمەنـدی داواکاری هەبوو بێزاری کردین ... فەرموو ئێستا چیت ئەوێ ؟)).

_ (( ئەمەوێ پێش هەموشتێك خۆم‌و ژنەکانم ببنەوە کۆشکەکەی خۆمـان, ئەو پیرێژنەشم بۆبەرن لەژوورێکدا حـەپس بکـەن ... دایکـی شـم بەرنـەوە دۆخی جاران )).

ئەمەندەی بڵێ یەك‌و دوو بینی چۆتەوە کۆشکەکەی خۆی‌و دایکی چۆتەوە دۆخی جارانی .پشیلەکە پیٚ ووت :

(( نیازت هەیە چی لەپیرێژنەکە بکەیت؟)).

_ (( ئەمەوێ بیکوژم؟)).

_ (( مکەیکوژەو بەرەو ڕوی منی بکەرەوە؟)).

پشیلەکەی بۆکردە ژورێکەوە, ئەویش هەر ڕۆژەی پارچەیەکی لێ ئـەکردەوە و ئەیخوارد هەتا تەنها ئێسقانەکەی هێشتەوەو بەو دەردەوە کوشتی.

پاش ئەمە ماوەیەك بەکامەرانی ژیان‌و هیچ نوشوستییان توش نەهات.

بەیانیەك لەگەڵ پشیلەکەدا چوون بۆڕاو دیسان قوتوەکەی لێ بەجێما کەژنەکان سەیریان کردو بینیان دیوێکی ئاوێنەیەو زۆریان لاجوان بوو لەو کاتەدا جولەکەیەکی وردەواڵە فرۆش بەبەردەرگادا تێپەڕی هاواری کەڵو پەلەکانی نەکرد , قوتوەکەیان پیشان داو ووتیان: (( لەمەت نیە؟)).

وردەواڵە فرۆشەکە کە چاوی بەقوتوەکەوت چاوی زەق بووو لەدڵی خویدا ووتی : ئای چەندساڵە عەودالتم !, بەلام خۆی گرتو هیچی دەرنەخستو پێی ووتن:

_ (( ئیستا نیمە, بەلام ئەگەر بمدەنی لەسەری دروست ئەکەمو بۆتان ئەهێنمەوە)).

پێیان ووت: (( ئاخر هی مێرەکەمانە ئەترسین تورە بێت )).

_ (( قەیناکات بیبە, بەلام زوو بۆمان بهێنەرەوە )).

وەلامی دایەوە:

_ (( ئاگاتەئێوارە بۆتان ئەهێنمەوە!)).

ئەمەی ووتو لێ یان دوورکەوتەوە .

کەقوتوەکەی دابەیەکدا دووقولەکە دەرکەوتنو بەمۆنی یەوە پێیان ووت.

_ (( ها , ئینجا نۆرەی تۆیە؟ دەی چیت ئەوێ ؟ )).

پێی ووتن:

(( ئەمەوێ ئەو دوژنەم بۆبەرنە دورگەیەکی دوور لەناوایی و مێردەکەشیان بەرنەوە دۆخی جارانی )).

یەکسەر داواکاریەکانی جێ بەجێکران.

کەئەحمەد هاتەوە کەلاوە شڕەکەی بینی بەهەردو چەپۆك دای بەسەری خۆیداو هاواری کرد :

ـ (( ئەی هاوار بەماڵم چیم بەخۆم کرد )).

ووردەواڵە فرۆشەکە لەدۆرگەکەدا، بەژنەکانی ووت:

ـ (( هیچ ئەم لاو ئەولای پێ ناوێ ... ئێوە ئێستا ژنی منن!)).

ژنەکان یەکی چەقۆیەکیان لێ هەلگرتو پێیان ووت: (( بێ بەلاماندا یان خۆمان ئەکوژین ، یان تۆ ئەکوژین !)).

بەم جۆرەهەرهەولێکی لەگەڵدان بەفیڕۆ چوو، ملیان نەنا، هەرکەلێ یان نزیك ئەبوەوە چەقۆکانیان لێ ڕاست ئەکردەوە.

بێینەوە سەردو کاری ئەحمەد . شەوو ڕۆژ ئەگریاو مانی لەخواردن گرتبووو قسەیشی نەئەکرد ڕۆژێك پشیلەکە

پێی ووت:

ـ (( هەرچەندە ئەبوایە چاوم هەلکۆلێتایە، ئەم جارەش قەیناکات ... بەلام تۆبۆچی ئەوەندە کەم مێشکیت ... ئەی بۆچی بەجارێك سیمرخەکەت لەبیر چۆتەوە؟ دەپەڕەکەی هەلکوڕوزێنە ئەو بتوانێت یارمەتیمان بداتو قوتودکەمان بۆبدۆزێتەوە !)).

ئەحمەد لەخۆشیدا پشیلەکەی ماچ کردو پەڕەکەی هەلکوڕوزان ئەوەندەی پێ نەچوو هاژەهاژ پەیدابوو سێبەرێك بەری ئاسمانی گرتو سیمرخەکە نیشتەوەو بەئەحمەدی ووت:

ـ (( فەرموو ، خێرە؟)) .

ـ (( خێری چی؟توشی بەلا بووم!)).

باسەکەی بۆگێڕایەوەو پێی ووت:

(( فریام بکەوە ... ئەگەر ئەزانیت لەکوێیە بۆم بهێنەرەوە ، ئەگینا حالم شڕەو لەداخ دا دیق ئەکەمو ئەمرم )).

(( بەڵێ ئەزانم لەكوێیە ... لای جولەكەیەكی پیری ووردەواڵە فرۆشە كە مرخی لەژنەكانت خۆش كردوە .... ئەتوانم خۆم بگەیەنمە ئەوێ، بەلاَم من تەنها لەگەڵ تۆدا ئەتوانم قسە بكەمو ناتوانم لەژنەكانتی بگەیەنم ... نامەیەكیان بۆبنوسەو بەپەتێك بی بەستە بەقاچمەوە بۆیان ئەبەم )).

ئەحمەد نامەیەكی نوسیو بەستی بەقاچی یەوە . ئەویش دای لەشەقەی باڵو فڕی هەرفڕی ... هەتا گەیشتە دۆرگەكە. خۆیدا بەپەنجەرەكەداو لەلێوارەكەی نیشتەوەو ژنەكان لەپێشدا ترسان بەلاّم كەلێ ی وورد بوونەوەو نامەكەیان بەقاچیەوە بینی ترسیان شكاو نامەكەیان لێ كردەوە بینیان لەمێردەكەیانەوەیەو نوسراوە: ((ژنەخۆشەویستەكانم ...ئەگەر ئەم نامەیەتان بەرچاو كەوت قوتوەكە ببەستن بەقاچی سیمرخەكەوە بۆم دێنێتەوە)).

ژنەكان ئاهێكی خۆشیان تێ گەڕایەوەو كەوتنە بیركردنەوەو كەچی بكەن سیمرخەكەش هەموو ڕۆژێك لەوكاتەدا ئەهاتوە بەر پەنجەرەكەو كەنەیزانی هیچیان دەسگیر نەبوە دوور ئەكەتەوە.

ڕۆژێك ژنەبچكۆلەكە شتێكی هات بەمێشك داو بڕیاریان دا بەجێی بهێنن ئەوەش ئەمەبوو:

هەردوكیان خۆیان ڕازاندەوە ئارایشتیان كرد. كەجولەكەكە هاتەوە بەڕوخۆشی یەوە چوون بەپیریەوەو

بەخێرها تنەوەیان كردو پێیان ووت:

(( هەتاكەیئێمە هەراوا بمێنینەوە ئیتر تاقەتمان چوەو بڕیارمان داوە چیت بوێت لەگەڵتا بیكەین!)).

کابرای جولەکە لەخۆشیدا حەپەسا. ژنەکان پێیان ووت: (( بەڵام بۆئەوەی زۆر بێ وەفانەبین ئەمانەوێ پێش ئەوەی بێیتەلامان لەبەرئاوێنەکەی مێردەکەماندا خۆمان برازێنینەوە ... ئەگەرماوتە بماندەرێ خۆمانی لەبەرچاك ئەکەین‌و ئەبینە ژنت !)).

قوتوەکەی دانێ‌و خۆی چوو لەبەر دەرگاکە دانیشت نەك فێڵیان بەدەستەوەبێت‌و بیبەنە دەرێ .

لەوکاتەدا سیمرخەکە پەیدابوو لەسەر لێواری پەنجەرەکە نیشتەوە. ژنەکان خێراقوتوەکەیان بەپەتێکەوە بەقاچیەوە بەستەوەو دای لەشەقەی باڵ‌و گەیانیەوە لای ئەحمەد .

ئەحمەد سیمرخەکەی ماچ کردو ووتی: (( زۆر سوپاس بۆتۆ کەفریام کەوتیت ... ئیتر خوات لەگەڵ‌و بچۆرەوە
شوێنی خۆت)).

سیمرخەکە دای لەشەقەی باڵ‌و لەچاو وون بوو. ئەحمەد کەقوتوەکەی دابەیەکدا دووقولەکە پەیدابوون‌و بەگرژیەوە ووتیان : ((ئەمەچی یە, هەر ڕۆژەی ئەماندەیتە دەست یەکێك؟ ئەمجارە بماندەیتە دەست یەکێکی تر نامان بینیتەوە .... دەی چیت ئەوێ؟)).

ووتی: (( ئەمجارەش لێم خۆش بن ... مەرج بێ ئیتر وای بپارێزم هەرگیز نەکەویتە دەست یەکێکی تر... ئێستا ئەمەوێ ژنەکانم بەکۆشکەکەوە بۆ بهێنەوەو ئەوەی قوتوەکەشی بردبوو بۆم بهێنن‌و. هەموو شتێك بخەنەوە دۆخی جارانی )).

ژنەکانی‌و کۆشك‌و جولوکەکەیان بۆهێنایەوەو کۆشکەکەیان لەجێگای کەلاوە شڕەکە دانایەوە. جولەکەکەی خستە ژوورێکەوەو پشیلەکەی

تێبەردا ئەویش بەهەمان دەستوری پیرێژنەکە هەر ڕۆژەی پارچەیەکی لێ نـــەکردەوە هــەتا گوشـــتی..ئەحمـــەدو دایکـــیو ژنـــەکانیو پشـــیلەکەی بەبەختیاری ژیان..

**منیش هاتمەوە هیچیان نەدامێ** ....

# ((چل برا ))

**ئەم چیرۆکە لەمانگی مارتی ١٩٨٠دالەکاك ( جەبار قادر تۆفیق ) وەرگیراوە کەقوتابی پۆلی یەکەمی کۆلێژی ( علوم ) ی زانکۆی سلێمانیەو سەرلەنوێ داڕێژراوەتەوە**

هەبوو... نەبوو... کەس لەخوا گەورەتر نەبوو, کەس لەبەندەی خراپ رووڕەشتر نەبوو, دووبرا هەبوون ئەوەندە هەژار بوون نانی شەویان نەبوو بیخۆن ... ئەم دێ بۆ ئەودێ ئەگەڕان بەلکو شتێکیان دەست بکەوێت‌و خێزانەکانیان بژێنن. جارێك لەکاتی گەڕانەومیاندا یەکێکیان ووتی:

_(( باهەر یەکێکمان بەدڵ دوعایەك بکەین, بەلکو خوا گیرای بکات)).

یەکەمیان ووتی:((خوایە, لەنیەتی ئەوەی هەتا ئەڕۆمەوە خانوەکەمان پڕبووبێت لەگەنم‌ونارد!)).

دووهەمیان ووتی: (( خوایە هەتا ئەڕۆمەوە ژنەکەم چل کوڕی بووبێت!)).

خوا دۆعای هەردووکیانی گیرا کردو چی یان داواکردبوو بۆیان بوو. کەڕۆیشتنەوە ماڵەوە یەکەمیان بینی ماڵەکەی پڕبوە لەگەنم‌و ئارد لەگەڵ ژن‌ومناڵەکانی دا شوکرانەیان کردو بەخۆشی ژیان. دووهەمیان کەچووەوە ماڵێ بینی ژنەکەی چل کوڕی بووەو هەموو لەبرساندا ئەگرین‌و دایکیان شیری نیە بیانداتێ. کابرا بەخۆی ووت:

_(( ئەی هەش بەسەرت بۆ خۆتو داوایەك كردت.... تۆخۆتو ژنەكەت پێ بەخێو نەئەكرا وا ئێستا چل كەسی تریشت بۆ زیاد بوو, ئینجا چی ئەكەیت؟)).

دانیشتوانی دێ كە بەمەیان زانی سیونۆمنداڵیان بەسەر سیو نۆماڵدا دابەش كرد بەخێویان بكەنو یەكێكیان لای دایكیان هێشتەوە.

كەنەختێك گەورەبوون هەر چلیان خستە بەر خوێندنو, بەم جۆرە مانەوە, هەتا گەورە بوون. ئەحمەد كەلای دایكی مابووەوە, بەبراكانی ووت:

_(( براینە, ئێمە هەموو برای یەكینو لەم ولاتەی خۆماندا هیچمان بۆ ناكرێت, باسەری خۆمان هەلگرینو بڕۆین بەلكو خوا دەرویەكمان لێ بكاتەوە)).

براكانی بەقسەیان كردو لێ یان دا ڕۆیشتن.

هەر ڕۆیشتن ... هەر ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە شارێك, چونكە كەسیان نەئەناسی چوونە خانێك. بەرێكەوت پادشای ئەو شارە لەگەڵ وەزیری دەستە ڕاستی دا هاتبوە خانەكە. كەئەو چل برایەی بینی زۆر سەری سوڕما چونكە هەموویان لەیەك ئەچوون. وەزیری ناردە لایان كەبزانێ چی باسە وەزیر چوو بۆلایانو پرسیاری لێ كردن چ كارەنو خەڵكی كوێنو بۆچی هاتوونەتە ئێرە. ئەوانیش باسی خۆیانیان بۆگێڕایەوەو وەزیر هاتەوە بۆلای پادشا قسەكانیانی پێ ڕاگەیاند. پادشا ووتی((بچۆ بۆلایان پێ یان بڵێ ئەگەر ئەیانەوێ ئەیانكەم بەكوڕی خۆم!)).

وەزیر قسەكانی پادشای پێ ووتن. ڕازی بوونو چوونە كۆشكی پادشاوەو وەك شازادە ژیان.

ماوەیەكی پێ چوو داوای ژنیان لەپادشاكرد... پادشا پێی ووتن: (( بەسەر چاو ڕۆڵەكانم... هەرساڵەی ژن بۆ یەكێكتان ئەهێنم!)).

ئەحمەد وەڵامی دایەوە:

_(( گەورەم, ئەگەر هەر ساڵەی بۆ یەكێكمان ژن بهێنی هەندێكمان پیرئەبین‌و ڕنگە بیشمرین, نۆرەمان ناگاتە سەر... لەبەر ئەوە ئەمانەوێ بۆ هەموومان بەیەكەوە ژن بهێنی!)).

پادشا ووتی (( ڕۆڵەكانم ناتوانم ئەم داوایەتان بەجێبێنم )).

_(( كەواتە ڕێگامان بدە بابڕۆین‌و چارێكی خۆمان بكەین )).

پادشا ناچار ڕێگای دان. فەرمانی دا چل ئەسپی نایابیان بۆ زین كردن‌و كەل‌و پەلی پێویستیان بۆ ئامادەكردن‌و لێیاندا ڕۆیشتن.

هەر ڕۆیشتن... هەرڕۆیشتن هەتا توشی پیاوێكی كورتە باڵای چل گەزە ڕیشەبوون ... لەئەحمەدی پرسی:

_(( ئەحمەد نۆغربێت, ئەوە بۆكوێ ئەچن؟ )).

_(( كەئەزانی ناوم ئەحمەدە ئەبێ بشزانی بۆ كوێ ئەچین )).

_(( ئێوە ڕێگاتان پڕلەمەترسی یە.... ئامۆژگاریتان ئەكەم بەقسەم بكەن ... كەئەڕۆن ئەگەنە مێرگوزارێكی خۆش‌و پڕلەكانی‌وئاو... لەو جێگایە دووركەونەوە لێ ی مەمێننەوە)) ئەمەی ووت‌و وون بوو .

پاش ماوەیەك گەیشتنە مێر گوزارێك ئەت ووت باخی بەهەشتە... براكانی باریان خست, بەڵام ئەحمەد پێی ووتن: ((بەقسەم بكەن لێرە مەمێننەوە تووشی بەڵایەك ئەبن... )).

بەقسەیان نەكردو لێ ی نوستن ... ئەحمەد دووركەوتەوە, لەجێگایەكی ڕەقەڵانی ووشكی بێ ئاودا باری خست‌و نێشكی گرت‌و نەنوست. زۆری پێ

نەچوو دێوێك پەیدابوو. ئەحمەد بەرەنگاری بوو, لێیان بووبەشەڕ... ناوی خوای لێهێنا, شیرێکی دا لەملی سەری پەڕان... لچو گوێی کردوخستیە خورجی ئەسپەکەیەوەو بێخەم نوست. کەبراکانی لەخەوهەستان پێیان ووت: (( کابرای کورتەبنەی چل گەزەڕیشە درۆی کرد, لێرەش نوستین‌و هیچیشمان بەسەر نەهات‌و شتێکیشمان نەبینی!)).

ئەحمەد ووتی: (( ئەو چاکتر !)).

باسی دێوەکەی بۆنەگێڕانەوە. نانیان خواردو لێ یان دایەوە ڕۆیشتن. زۆری پێ نەچوو هەمان کابرای کورتە بالآی چل گەزە ڕیشەیان بینیەوەو هەمان ئامۆژگاری ئەحمەدی کردەوەو وون بووەوە.

هەر ڕۆیشتن ... هەررۆیشتن... هەتا گەیشتنە مێر گوزارێك لەوەی جاری پێشوو خۆشترو دلگیر تربوو ئەحمەد زۆر تکای لێ کردن کەلەوێ نەمێننەوە بەقسەیان نەکرد, پێ یان ووت:

_(( دوێنێیش هەر وات ووت‌و هیچیش نەبوو... )).

ئەوان باریان خست‌و بێ خەم لێ ی نوستن, ئەحمەد بەهەمان شێوەی پێشوو دوورکەوتەوەو چاوەڕێی کرد. لەنیوە شەودا دێوێك بەبۆڵە بۆڵ هات‌و لەدوورەوە هاواری کرد: (( کێ یە زاتی کردووە ماڵە کەم پیس بکات!)).

ئەحمەد دووبارە بەرنگاری بوو لەئەنجامادا شیرێکی دالەملی‌و سەری پەڕاندو لچو گوێی ئەویشی بڕی‌وخستیە خورجی ئەسپەکەیەوەو نووست. بەیانی براکانی ماوەیەکی زۆر گاڵتە یان پێکرد کەچۆن ترسەکەی لەجێی خۆیدا نەبووەو هیچیان بەسەر نەهاتووە.

ئەویش بێ دەنگ بوو, قسەی نەکرد.

نانیان خواردو لێ یاندا ڕۆیشتن. زۆری پێ نەچوو هەمان بستە بالأی چل گەزەڕیشەیان پێگەیشتەوە بە ئەحمەدی ووت:

_((ئەحمەد, هەرچەند براکانت بەگوێت ناکەن بەلاّم ئەم جارەش هەمان ئامۆژگاریم هەیەو بەقسەم بکە )).

ئەمەی ووتو دووبارە غەیب بوەوە.

هەر ڕۆیشتن ... هەر ڕۆیشتن... هەتا گەیشتنە مێر گوزارێك ئەوانەی پێشوو لەچاویدا درِكو دالّ بوون, هەر چەندە ئەحمەد هەوڵی دا برا کانی گوێیان لێ نەگرتوو باریان خستو لێ ی نووستن. ئەحمەد بەهەمان شێوە لێیان دوور کەوتەوەو ئێشکی گرت. لەنیوە شەودا دەڵە دێویکی زەرد بەبۆڵە بۆڵ هاتو لەدوورەوە هاواری کرد: (( ئەوە کێ یە وێراویەتی بێتە ماڵی منەوەو پیسی بکات؟ )).

ئەحمەد لەدڵی خۆیدا ووتی:

_(( ئەمجارە من خۆمی تێناگەیەنم, بزانم چی ئەکاتو براکانم چی یان لەدەست دێ )).

ئەمەی ووتو خۆی شاردەوەو دێوەکە ئەی بینی. دەڵە دێوەکە لەبراکانی نزیك بوەوەو کەزانی نوستون هیچی لێ نەکردن, بەلاّم جادویەکی لێکردن هەموویانی کرد بەبەردا.

کە بەیانی ئەحمەد لەخەو هەستاو براکانی بەو جۆرە بینی دەستی کرد بەگریانو کەچاری نەما سواری ئەسپەکەیبووو, بەدڵ شکاوییەوە لێ ی داڕۆیشت.

هەر ڕۆیشت... هەر ڕۆیشت... هەتا گەیشت بەپیاوە کورتە بنە چل گەزە ڕیشەکە. پێی ووت:

_(( ئای ئەحمەد !.... بەقسەتان نەکردم هەتا براکانت بەو حاڵە گەیشتن کەپێی گەیشتن ...)).

ئەحمەد زۆری لێ پاڕایەوەو پێی ووت:

_((بەخوا دیارە تۆ پیاو چاکیتوو غەیب زانی ... یارمەتیم بدە بەڵکو براکانم دەست بکەوێتەوە)).

وەڵامی دایەوە: (( ئەو دێوانەی هاتنە سەرتان سێ خوشك بوون، تۆ دووانیانت سەربڕین‌و دەڵە دێوە زەرددکەیان براکانتی بەو دەردە برد... ئەویان چل کوڕی هەیە حەزیان لە چل کچی پادشایەك کردوە. هەرچەندە هەوڵ ئەدەن زەفەریان پێ نابەن‌و دەست گیریان نابێ ئێستا بڕۆو لەپاڵ ئەشکەوتەکەی پشت ئەو شاخەوە دانیشتووە گردێکی کردوە بەبەردێکی دستاڕۆ گردێکی تری داوە بەسەریداو گەنمیان پێ ئەهاڕێ بۆ ئەوەی نان بۆ کوڕەکانی بکات... مەمکی چەپی داوە بەسەر شانی ڕاستی داو مەمکی ڕاستی داوە بەسەرشانی چەپی دا... بڕۆ لەپشتەوە بەدزییەوە مەمکی ڕاستی بمژە... بەڵام نەکەی لێت تێك بچێت‌ومەمکی چەپی بمژی ئەگینا ئەت کات بەبەرد... کەمەمکی ڕاستیت مژی خۆتی پیشان بدەو (بڵێ بمکە بەکوڕی خۆت)... کەئەمەت ووت ئەو پێت ئەڵێ.

(بەمەرجێك ئەت کەم بەکوڕی خۆم کە هەرچل کچی پادشابێنیت بۆ هەر چل کوڕەکەم ) تۆش پێی بڵێ. (منیش مەرجم هەیە، براکانم زیندو بکەرەوە هەرکچەیان ئەخەمە باخڵی کوڕێکتەوە ).

پیاوەی کورتە باڵای چل گەزەڕیشە چەند ئامۆژگارییەکی تری کردو وون بوو.

ئەحمەد ڕۆیشت ... باسەرتان نەیەشێنم, هەر ڕۆیشت... هەر رۆیشت هەتا گەیشتە لای دەڵە دێوە زەردەکەو کابرای کورتە بالاّ چی پێ ووتبوو کردیو لەئەنجامدا ڕازی بوو بیکات بەکوڕی خۆی . بەڵام پێی ووت:

(( ئێستا کوڕەکانم دێنەوە, خۆت بشارەوە چونکە نات ناسن نەك گەبینیانیت بتخۆن)).

ئەحمەد خۆی شاردەوە. زۆری پێنەچوو چل دێوەکە بەبۆڵە بۆڵ هاتنەوەو لەدوورەوە هاواریان کردو ووتیان:

(( دایە ... بۆن دێ.... بۆنی بێگانان دێ... کێهاتۆتە ئێرە؟)).

وەرامی دایەوە : (( ڕۆڵەکانم ... من کاتی خۆی پێش باوکتان شویەکی ترم کردبوو کوڕێکم لێ یبووبوو, وائێستا هاتوە بۆلامان ... کەباسی ئێوەم بۆکرد ووتی گوایە بەئاسانی ئەتوانێ کچەکانی پادشاتان دەسگیر بکات )).

لە خۆشیاندا کەوتنە هاوار هاوارو ئەحمەدیان هێناو کەوتنە ماچ کردنیوپێیان ووت:

(( بەخێر بێی سەرچاومان هاتی ... بەڵام چۆن ئەوکچانەمان بۆ نەهێنیت؟.... لەو دیو دیوارێرێکی ئەودندە بەرزەوە شاردوویانەتەوە کەکەس نایان گاتێ )).

وەرامی دایەوە : (( هەموو شتێك بەمێشك ئەکرێت ... بڕۆن چەکوشێكو هەشتا سنگی بەهێزی ئاسنم بۆ بهێننو چل بەردی بچوکیشم بۆ بخەنە تورەکەیەکەوە و بابڕۆین )).

ئەودندەی بلێی یەكو دوو چەکوشێكو هەشتا سنگو تورەکەیەك بەردیان بۆهێنا. کەتاریك داهات کردیانە قەلاّن دۆشکانو لەبەر دیوارە بەرزەکەی کۆشکی پادشادا دایاننا ... ئەحمەد پێی ووتن :

_ (( مـن ئێسـتا ئەچـمە ئـەو دیـوەوە ... هەربـەردێك هـەڵ ئەدەمـە ئـەم دیوەوە یەکێکتان سەرکەون‌و وەرنە ئەودیو یـەك یـەك ئەتانخەمـە باخـەڵی کچی خۆیەوە )).

ووتیان: (( ئاخر ناتوانین سەرکەوین ... ئەگەر بمان توانیایە دەمێك بـوو فڕاندبومانن )).

ووتی: (( ئەی ئەو سنگانەمان بۆچی یە؟...)).

چل سنگی بەدیوارەکەدا یەك بەدوای یەك دا داکوتاو پێی ووتن:

_ (( وامـن ئەچـمە ئـەودیو , هەربـەردێك فـڕێ ئەدەمـە ئـەم دیـوەوە یەکێکتان بەم سنگانەدا سـەرکەوێتە سـەردیوارەکەو چـل سنگەکەی تـریش بـەو دیـودا دائـەکوتم پیایـدا بچـنە خـوارەوەو ئەیبـەم ئەیخەمـە باخـەڵی خۆشەویستەکەیەوە !...)).

بـەم جـۆرە ئەحمـەد بەسـنگەکاندا هـەڵ ئەگـەڕێ‌و ئەچـێتە ئـەودیوو هەربـەردێك هـەڵ ئەداتـە ئـەم دیـو دێوێکیـان ئەچـێتە ئـەودیو , لـەوێ بەئاسانی سەری ئەبڕێ‌و لچ‌و لێوی ئەکات‌و ئەی خاتە تورەکەی بەردەکەوە هەتا هەرچلیان ئەکوژێ

دوایی ڕائەکاتەوە لای دەڵە دێوی دایکیان‌و پێی ئەڵێ :

_ (( واهەرچل کوڕەکەتم بـەئاواتی خۆیـان گەیانـدو ئیسـتا هـەر یەکـەیان لەباخەڵی خۆشەویستەکەیدا خەوتوە , دەی ئینجا نۆرەی تۆیە پەیمانەکەت بەجی بهێنیت‌و براکانم ڕزگاربکەیت !)).

دێوەکە پێی ووت:

_ (( وەرە سکم هەڵدرە, کولەکەی ڕۆحەکەم ئەوەندەی شەمامەیەکە لـەناو سکمدایە دەری بهێنە لەلایەکەوە داینێ‌و پارێزگـاری بکـە, جـەرگ‌و دڵەکـەم

سووربكەرەوەو ڕۆنەكەی بدە لەبراكانت چاك ئەبنەوە, دوایی ڕۆحەكە م بخەرەوە شوێنی خۆیو ڕۆنەكە بدە لەبرینەكانی سكم منیش چاك ئەبمەوە)).

ئەحەد بەشمشێرەكەی سكی هەڵدڕیو كولەكەی ڕۆحەكەی دەرهێناو جەرگو دڵەكەی سوركردەوەو لەبراكانی هەڵ سوو,

یەكسەر پژمینو هەستانو ووتیان:

_ (( ئەحمەد ئەوە بۆچی ئەمڕۆ درەنگ خەبەرمان بۆتەوە؟... بۆچی زوو خەبەرت نەكردینەوە ؟)).

ئەحمەد پیّی نەووتن چ باسە. چوو لەولاوە ڕۆحی دەڵ دێوەكەی خستە سەرزەویو لەقەیەكی لیّ داو پانی كردەوە, ئەوناوە بوبە چەڕە دوكەڵێك چاو چاوی نەئەبینی, ئیتر دەڵە دێوەكە زیندو نەبوەوە.

پاش ئەمە خۆیان كۆكردەوەو ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە چل كچەكە , بینیان سوار ئەگەڕیّو جاڕ ئەدات كەكیّ چاكەی لەگەڵ پادشا كردوە بابێت چاكەی بداتەوە .

ئەحمەد بەبراكانی ووت: ((بابڕۆین بۆلای پادشا بزانین چ باسە بەڵكو شتێكمان دەستگیر بێت )).

كەچونە لای پادشا لەچو لێوەكانی پیشانداو پیّی ووت: (( پادشا , من هەرچل دێوەكانم كوشتوە, ئەمەویّ لەپاداشی ئەوەدا كچە كانتمان لیّ مارە بكەیت )).

پادشا پیّی ووت: (( تۆ دێوەكانت كوشتوە تەنها كچێكم لەتۆ مارە ئەكەم, خۆبراكانت هیچیان نەكردوە ... بابێن یاری دارشەقێن لەگەڵ كچەكانمدا بكەن ئەگەر بردیانەوە لێیان مارە ئەكەم, ئەگینا هیچ )).

بەمەڕازی بوونو دەستیان کرد بەدارشەقێن کردن, لەبەر ئەوەی براکانی دڵیان نەئەهات لەکچەکان بەرنەوە لەبەرئەوە لەپێشدا هەر ژێر ئەکەوتن ... هەتا ئەحمەد بەهەڵە داوان خۆی گەیاندنیو چوە جێگای یەکێکیانەوە ... لەبەر ئەوەی هەموویان لەیەك ئەچوون کەس بەمەی نەئەزانیو یەك یەك لەهەموویانی بردەوە.خەبەریان دا بەپادشا کەکچەکانی دۆڕاندویانە.. دایان لەتەقەی دەهۆڵو زورشناو لێیان مارەکردن. پادشا خەڵاتی باشی کردنو گەڕانەوە بەرەو شاری خۆییان.

زۆری پێ نەچوو دێوێك لەشێوەی پەڵە هەورێکی چڵکندا لەژورسەریان پەیدابووو دەستی کرد بەهاوارو گرمەگرمو پێیووتن:

_ (( ڕاوەستن , بۆ کوێ ئەچن ... مەلەك ڕێحانم بۆنەهێنن ناهێڵم لێرەوە تێ پەڕنو هەمووتان لەناو ئەبەم )).

ئەحمەد بەبراکانی ووت: (( بائەگەر فەوتاشین هەرمن بفەوتێم , ئێوە بڕۆنو هەرمن خۆم ئەچم بۆلای مەلەك ڕێحان , بەلام ژنەکەم لەگەڵ خۆتاندا بەرنو ئاگاداری بکەن هەتا دێمەوە )).

لەگەڵ ژنەکەیدائەڵقەکانیان گۆڕیەوە, ئەوان بەرەو شاریخۆیان ڕۆیشتنوئەحمەدیش بەرەو شاری مەلەك ڕێحان ملی نا.

هەر ڕۆیشت ... هەر ڕۆیشت ... بینی جوانەگایەك لەقوڕداچەقیوەو هەرچەند ئەکات ناتوانێت لێ ی دەرچێت. ئەوی لەکلکیو دەری هێنا. جوانەگایەکە پێی ووت:

_ (( لەپاداشی ئەم چاکەیەدا تاڵێك لەسەری کلکم هەڵکێشە, هەرکاتێك پێویستت پێم بوو هەڵی کورشوزێنە ئەگەمەلاتو فریات ئەکەووم )).

ئەحمەد تالێکی لێکردەوەو ڕۆیشت. گەیشتە جۆگایەك, بینی, مێرولە ڕێچکەیان بەستوە ئەیانەوێت بپەڕنەوە بەلام ئەکەونە ناوی‌و ئەخنکێن. پردێکی دارینی بۆدروست کردن‌و بەسەریدا پەڕینەوە.

شای مێرولەکان پێی ووت: (( مادام ئەم چاکەیەت لەگەڵدا کردین مویەکی بەرسمێڵم هەڵکێشەو, هەرکاتێك پێویستت پێمان بوو هەڵی کوڕوزێنە ئەگەینەلات‌و فریات ئەکەوین )).

موویەکی لێ هەڵکێشاو ڕۆیشت ... گەیشتە دەریایەك و بینی پیاوێك دانیشتوە سەیری ئاوەکە ئەکات. لێ ی پرسی. ((هابرا, ئەوە خێرە لەم گوێ ئاوە دانیشتوویت ؟)).

وەرامی دایەوە بەخوابرا حەوت ساڵە سوژنێکم کەوتۆتە ناوی ئێستاش گوێم لەزرنگەکەیەتی , چاوەڕێم بەڵکو سەرئاو بکەوێتەوە )).

_ (( ئای لەم هونەرە!... ئەمەیە گوێ سوکی!.. )).

وەرامی دایەوە :

_ (( هونەر هونەری من نیە, هونەر هونەری ئەحمەدە کەچل‌و سێ دێوی کوشتوە )).

_ (( ئەگەر ئەحمەدببینی چی لێ ئەکەیت؟)).

_ (( خەڵاتی ئەکەم )).

_ (( من ئەووم)).

_ (( دەکەواتە ها تالێك لەسمێڵم بگرە , هەرکاتێك پێویستت پێم بوو هەڵی بکوڕوزێنە ئەگەمەلات )).

تاڵە مویەکی دایەو ئەحمەد ڕۆیشت.. گەیشتە دێ یەك بینی خەڵکی دێ هەمویێکەوە نان‌وخواردن دروست ئەکەن‌و ئەیکەنە دەمی کابرایەکەوە

کـەناوی تێـر نەخۆرەیـە , بـەڵام هـەر هـاوار ئـەکات: (( ئـای مـردم لەبرساندا!)).

ئەحمەد لێ ی چوە پێشەوەو ووتی:

_ (( ئای لەم هونەرە!... ئەمەیە زۆرخۆر!)).

تێرنەخۆرە وەڵامی دایەوە:

_ ((هونەر هونەری من نیە هونەر هونـەری ئەحمـەدە کەچـڵو سێ دێـوی کوشتوە )).

_ (( ئەگەر بیبینی چی لێ ئەکەیت؟)).

_ (( خەڵاتی ئەکەم )).

_ (( من ئەوم )).

_ (( دەکەواتە ئەم تاڵە سمێڵەم بگرە, ئەگـەر لێـت قـەوما هـەڵی کورِوزێنـە ئەگەمە فریات!)).

تاڵێـك مـووی دایـەو ئەحمـەد رِۆیشـت... گەیشـتە دەعبایـەك بەرداشـێکی بەسـتوە بەقاچـیەوە ئەوەنـدەی کێوێـك ئـەبێت ئەحمـەد پـێ ی ووت: (( ئەوبەرداشەت بۆچی بەستوە بەقاچتەوە؟)).

وەڵامی دایەوە.

_ (( ئەوە ئەچم رِاوە ئاسکی پێ ئەکەم ))..

ئەمەیە هونەر ... ئەمەیە رِاوچی !)).

_ (( هونەر هونەری من نیە هونەر هونەری ئەحمـەدە کەچـڵو سێ دێـوی کوشتوە )).

_ (( ئەگەر بیبینی چی لێ ئەکەیت؟)).

_ (( خەڵاتی ئەکەم )).

(( من ئەووم)).

(( دەگەواتە ئەم تاڵەی سمێلم بگرە , ئەگەر لێت قەوما هەڵی کوڕوزێنە ئەگەمە فریات )).

تاڵێك موی دایەو ئەحمەد ڕیشت.

هەر ڕۆیشت ....هەر رۆیشت .... هەتا گەیشتە شارێك , بینی کۆشکێکی چەند نهۆم بەرز بۆتەوەدو هەمووی لەکەللە سەر دروست کراوە ... بینی کچێك لەو کۆشکە هاتە دەرەوە ئەوەندە جوان بوو دڵی داخورپان کچەکەش چاوی پیَی کەوت چووبە دڵیداو پیَی ووت:

_ (( هاکابرا, ئەوە خێر هاتوی تە ئەم شارە؟)).

لیَ ی پرسی:

_ (( چۆن؟)).

_ (( ئەو کۆشکە ئەبینی ئەوەلەکەللە سەری ئەوانە دروست کراوە کە هاتون بۆ خواز بێنی من. باوکم چەند مەرجێکی داناوە ئەوەی داوام ئەکات بەجیَیان نەهێنێت لەسەری ئەدات. یەکەم شت جامێك ئاووت ئەداتیَ ئەبیَ سری بخەیتە نهۆمی سەرەوەو بیهێنیتە خوارەوە بەڵام نابی دڵۆپێکی لیَ برژیَ, ئەم ئەموستیلەیەت ئەدەمی بیخەرە جامەکەوە. ئاوەکە ئەمەیەو کەهاتیتە خوارەوە لیَ ی دەر بهێنە وەك خۆی لیَ دێتەوە.

ئەمەی ووتو لیَ ی جیا بوەوە ئەحمەد چو بۆلای پادشاو خوازبێنی مەلەك ڕێحانی لیَ کرد. پاشا پیَی ووت:

_ ((ئەم کۆشکە ئەبینیت؟ ئەمەلەکەللە سەری ئەوانە دروست کراوون کەهاتوون بۆخوازبێنی کچەکەم. من چەند مەرجێکم هەیە, بەجێیان بهێنی پێشکەشت ئەکەم بەجێیان نەهێنی لەسەرت ئەدەم )).

ئەحمەد ووتی: (( هە موو مەرجێکم قبوڵە )).

_ (( ئەم جامە ئاوە بەرە نهۆمی سەردووەو بیهێنەرە خواردوە و یەك دڵۆپی لێ برژێت لەسەرت ئەدەم )).

ئەحمەد جامەکەی هەڵگرتو کەلە پادشا دوورکەوتەوە ئەموستیلەکەی مەلەك ڕێحانی تێ خست, مەیی‌و بردیە سەرەوەو هێنایە خواری بێ ئەوەی دڵۆپێکی لێ بڕژێت. پێش ئەوەی بگاتەوە لای پادشا ئەموستیلەکەی لێ دەرهێناو ئاوەکەی وەك خۆی لێ هاتەوە.

پاشا پێی ووت:

_((ئەمەت بردەوە, بەڵام ماوە!)).

ئەحمەد ووتی : (ئامادەم!).

پادشا ووتی: (( جوانە گایەکم هەیە وێنەی نیە, تۆش جوانە گایەك پەیدابکە شەڕە قۆچیان پێ بکەین, ئەوەی من بەزی بردووتەتەوەو ئەوەی تۆ بەزی لەسەرت ئەدەم...)).

ئەو شەوە ئەحمەد خەو نەچووە چاوی بەیانی ئەو جوانەگایەی بیر کەوتەوە کەلە قوڕەکە ڕزگار ی کردبوو, بەخۆی ووت: (( باتاڵە مووەکەی هەڵ بکرووزێنم بزانم ڕاستی کرد!)).

هەرکەمووەکەی هەڵ کوروزاند جوانە گایەکە پەیدابوو. لەکاتی دیاری کراودا گایەکەی بردە مەیدان. گایەکەی پادشا لەچاوی‌دا گوێرەکەبوو. هەر کەئەحمەد گایەکەی خۆی بەردا پەلاماری گاکەی پادشای داو بەقۆچ ڕاوی ناو سواری‌کۆڵی بوو.

پادشا بەئەحمەدی ووت: ((ئەمەشت بردەوە, بەڵام ماوە!)).

ئەحمەد ووتی: ((ئامادەم!)).

پادشا ووتی: (( زوورێك پڕئەكەین لەگەنم‌و، جۆو، نیسك‌و نۆك‌و هەموو جۆرە دانەوێڵەیەك، ئەبێ هەتا بەیانی لە یەكیان جیا بكەیتەوە، جیایان نەكەیتەوە لەسەرت ئەدەم!)).

زوورێكیان بۆ پڕكرد لەدانەوێڵەو بەجێیان هێشت. شەوێ دۆش دامابوو نەیئەزانی چی بكات... لەپڕ مێرولەكانی بیر كەوتەوە، بەخۆی ووت: ((تەنها مەگەر مێروله بتوانێت ئەم كارەبكات.. باموووەكەی هەڵكوڕوزێنم، بزانم ڕاستی كرد!)). تاڵەمووەكەی هەڵكوڕوزاند، ئەوەندەی بڵێ ی یەك‌و دوو لەدیوارو درزی دەرگاو پەنجەرەو بن میچەوە مێروولە ڕێچكەیان بەست‌و دستیان بەكاركرد، ئەوەندەی پێ نەچوو هەر چەشنە دانەوێڵە یەكیان بەجیا لەلایەكەوە دانا... بەیانی ئەحمەد ناردی بۆلای پادشا كەپێی بلێن كارەكەی بەجێ هێناوە. كەپادشا هات واقی وڕماو ووتی: (( دیارە پیاوەكانم ناپاكی یان لەگەڵ كردووم‌و بەم جۆرە بردبێت تەوە، بەلام ماوە)).

ئەحمەدی ووتی: (ئامادەم!).

پادشا فەرمانی دا ئەوەندەیان خواردن دروست كرد بەشی پەنجاكەسی ئەكردو بەئەحمەدی ووت:

_((هەتا بەیانی هەمووی بخۆی، بردووتەتەوە، نەیخۆیت لەسەرت ئەدەم!)).

ئەحمەدیان كردە زوورێكەوەو خواردنەكەیان بۆداناو بەجێیان هێشت.. دۆش داماو نەیئەزانی چی بكات. لەپڕمەحمود تێر نەخۆری بیر كەوتەوەو بەخۆی ووت:

_((خوا بتگرێ مەگەر تەنها ئەو فریات بكەوێت... تاڵە مووەكەی هەڵكڕوزێنە بزانە ڕاستی كرد!)).

هەر مووەکەی هەڵکروزاند مەحمودی تێرنەخۆر پەیدابوو, هاواری کرد: ((بۆنی خواردن دێت ... ئای برسیمە!)).

ئەوەندەی پێ نەچوو مەنجەڵەکانی بەجۆرێك لستەوە وات ئەزانی بەحەوت ئاو شۆراون. نەختێکیشی بۆئەحمەد نەهێشتەوە بیخوات, لەبەر ئەوە بەیانی زوو ناردی بۆلای پادشا کەپێی بڵێن کەمێك خواردنی بۆ بنێرێت چونکە خەریکە لەبرساندا بمرێت. پادشا سەری سوڕماو ووتی: (( ئەم کابرایە ئەبێ جادووگەربێت!)).

پادشا هات بۆلای ئەحمەدو پێی ووت:

_(( ئەمەشت بردەوە, بەڵام ماوە!)).

_(ئامادەم).

_((من تەتەرێکی تیژڕەوم هەیە لەسەر کانیو ئاوەکەی ئەو شارەی نزیکماندا شمشێرێکم لێ بەجێ ماوە ئەینێرم بیهێنێتەوە تۆش برۆ, ئەگەر تۆ زووتر هێناتەوە بردووتەتەوە, ئەو زووتر هێنایەوە لەسەرت ئەدەم!)).

تەتەرەکەی کەوتەڕێو ئەحمەد بەدوایدا, بەڵام بەتۆزی قاچیشی دا نەگەیشت.. لەپڕکابرای, ڕاوکەری بەرداش بەقاچی بیر کەوتەوە. تاڵەمووەکەی هەڵکروزاندو یەکسەر پەیدابوو, ئەحمەد کارەکەی پێ سپاردو ئەوەندەی پێ نەچوو شمشێرەکەی پادشای هێنایەوەو بەدزیەوە دای بەئەحمەدوئەویش بردی بۆ پادشاو پێی ووت: ((فەرمووپادشا... ببورەگەردواکەوتبم!....)).

پادشا بەخەفەتەوە پێی ووت:

_((هەموو داواکاریەکانت بەجێ هێناو مەلەك ڕێحانت بردەوە... بەڵام ئەبێ ئەمشەو لەو ڕەشماڵەدا بمێنیتەوەو بەیانی برۆن)).

ئەحمەد ووتی: (باشە!).

بەڵام بیری کردەوەو بەخۆی ووت: ((باشە, بۆچی ئەیەوێ لەوچادرەدا بمێنمەوە؟ وادیارە نیازی خراپە! بامووی کابرای گوێ سووک هەڵکڕوزێنم, بەڵکو بێتو گوێیان لێ بگرێتو بزانێت تەکبیری چیم لێ ئەکەن!)).

موەکەی هەڵکڕوزاندو کابرا لەبەردەمی دا قوت بووەوەو تێی گەیاند چ باسە. کابرا چووە کۆشکی پادشاو لەپشت دیواری دیوەخانەوە گوێی هەڵخست... لەدیوارەکەوە گوێی لێ بوو پادشاو پیاوماقوڵانی تەگبیری کوشتنی ئەحمەد ئەکەن بۆئەوەی نەهێڵن مەلەك ڕێحان ببات... دێتەوەلای ئەحمەدو باسەکەی بۆ ئەگێڕێتەوەو پێی ئەڵێ هەتا زووە مەلەك ڕێحان ببات و ڕابکەن... بەقسەی کردو پەلی مەلەك ڕێحانی گرتو لێ یاندا ڕۆیشتن... کەلەشاردوورکەوتنەوە پەڵە هەورەکەی بینی نیشتە سەر زەویو بوو بەدێوێكو مەلەك ڕێحانی برد... مەلەك ڕێحان ڕووی کردە ئەحمەدو پێی ووت:

_((ئەگەر ئەمزانی منت بۆ ئەمە ئەوێت وام ئەکرد لەیەکەم ڕۆژەوە باوکم لەسەرتەدات!...)).

ئەحمەد پێی ووت: ((خەمت نەبێت.. جێت ناهێڵمو ڕزگارت ئکەم)).

دێوەکە مەلەك ڕێحانی بردە ئەشکەوتێکەوە, کەبەیانیان ئەچووە دەرەوە تاشە بەردێکی گەورەی ئەنا بەدەمەکەیەوەو کەئێوارە ئەهاتەوە لای ئەبردو ئەچووە ژوورەوەو بەردەکەی پێوەئەنایەوە. ئەحمەد هەر دەوروخولی ئەشکەوتەکەی ئەدا هەتا ڕۆژێك هەلی دەست کەوتو لەدرزی بەردەکەوە دەنگی گەیشتە مەلەك ڕێحان وپێی ووت:

_بۆ ئەوەی ڕزگارت بێت چیت پێ ئەڵێم وابکە... کە ئێوارە دێوەکە هاتەوە پێی بڵێ تاقەتت چووە بەڕۆژ کە بەجێت دێڵێ هیچ نیە خۆتی پێوە خەریك بکەیت.. کە ووتی چیت ئەوێت پێی بڵێ کولەکەی ڕۆحەکەیت بداتێ بەڕۆژیاری پێ بکەیت )).

کە ئێوارە دێوەکە هاتەوە مەلەك ڕێحان داوای کولەکەی ڕۆحەکەی لێ کرد, دێوەکە پێی ووت:

_(( ڕۆحەکەم ئەوەتا لەو کۆڵەکەیەدایە)).

مەلەك ڕێحان پەلاماری کۆڵەکەی ئەداتو ماچی ئەکات. دێوەکە پێ ئەکەنێو پێی ووت:

_(( چۆن باوەڕت کرد؟ ڕۆحەکەم ئەوەتا لەو گۆزەیەدایە!)).

مەلەك ڕێحان پەلاماری گۆزەکەیداو ماچی کرد. دووبارە دێوەکە پێکەنیو پێی ووت:

_((بۆم دەرکەوت کەتۆ بەڕاستی منت خۆش ئەوێت, لەبەر ئەوە ڕاستت پێ ئەڵێم ڕۆحەکەم لەکوێیە... لەسکی مانگا زەردەکەی شوانی دێی پشت ئەو شاخەدایە)).

کەدێوەکە ئەچێتە دەرەوە مەلەك ڕێحان باسەکە بۆ ئەحمەد ئەگێڕێتەوە.. ئەحمەد دێیەکەی دۆزییەوەو چوەلای شوانەکە پێی ووت:

_((من لەدنیادا تەنها ئەو مانگایە شك ئەبەم, چۆن بیفرۆشم؟)).

_((خالۆگیان, ئەوەندەت ئەدەمێ دەمانگای پێ بکڕیت.. من خەوم دیوەو لەخەوەکەمدا ئاهم کردووە کەمانگازەردەی ئەم دێیە سەربڕمو جەرگو دڵەکەی بکەم بەخێر... گۆشتەکەی ئەدەم بەخۆت...)).

بەهەر جۆرێك بوو مانگا زەردەکەی لێ کڕی, سەری بڕیو گۆشتەکەی بۆ بەجێ هێشتنو جەرگو دڵو کوولەکەی ڕۆحی دێوەکەی لەگەڵ خۆی بردو گەڕایەوە بەر ئەشکەوتەکە. لەوکاتەدا دێوەکە هاتەوە, کە ئەحمەدی دی پێی ووت:

_((ئەوە بۆچی هەتا ئێستا لێرەیت؟ بۆ ناڕۆیت بەلای کاری خۆتەوە؟... ئەی ئەمە چیە پێت؟)).

پێی ووت:

_((ئەمە کوولەکەی ڕۆحەکەتە بەدەستمەوە!)).

دێوەکە لێ ی پاڕایەوەو پێی ووت:

_((بۆ خاتری خوا بمدەرەوە... نەکەی ئەزێتی بدەیت!)).

ئەحمەد ووتی:

_(( ئەو تاشە بەردە لادەو مەلەك ڕێحانم بدەرەوە ڕۆحەکەت ئەدەمەوە)).

دێوەکە تاشەبەردەکەی لابرد. کەمەلەك ڕێحان هاتەدەرەوە ئەحمەد کولەکەی ڕۆحەکەی خستە ژێر پێیو پانو پلیشی کردەوە. دێوەکە ناڵەیەکی لێ هەستاو کەوتو مردو لاشەکەی وون بوو.

ئەحمەد پەلی مەلەك ڕێحانی گرتو بەرەو شارەکەی خۆی ملی ڕێگایان گرت.کەگەیشتنە نزیك شار لەدوورەوە گوێیان لەدەهۆڵو زوورنابوو.. ئەبینن شاییو زەماوەندە.. ئەحمەد پیاوێك ڕائەگرێتو لێ ی ئەپرسێت کەچ باسە... کابرا پێی ووت:

_((چل برا ساڵێك بەوعەیام چل خوشکیان مارە کردبوو, برایەکیان نەهاتەوەو وون بوو و ژنەکەی لەگەڵ براکانی تریدا هاتبۆوە. بەڕێکەوت

ژنـی برایـەکی تریـان ئـەمرێت ئێسـتا ژنـی بـرا وون بووەکـە لـەبرا ژن مردووەکە مارە ئەکەن!)).

ئەحمەد ئەحەپەسیّو ئەڵێ: (نابێ!).

بـەپرتاو خـۆی گەیانـدە براکـانیو ناسـیانەوە, ئەموستیلەکەشـی نـاردەوە بۆژنەکـەی بـۆ ئـەوەی بزانێـت هاتۆتـەوە.. مەلـەك ڕێحانیـان لـەبرا ژن مردووەکـەیان مـارە کـردو هـەموو بەیـەك شـادو شـوکر بوونـەوەو هـەموو بەکامەرانی ژیان.

**منیش هاتمەوە هیچیان نەدامێ.**

# ((عەزە ترسنۆك))

**ئەم چیرۆکەش لەکاك جبار قادر تۆفیق وەرگیراوەوسەر لەنوێ دارێژراوەتەوە.**
**جەلال تەقی**

هەبوو... نەبوو...عەزە ترسنۆکێك هەبوو.... ئەوەندە ترسنۆك بوو کەشەو چوونەسەر پێشاوی هەبوایە ژنەکەی لەگەڵی نەچوایە نەی ئەوێرا بەتەنها بچێتە دەرەوەو ئەی کردە ژێر خۆی. ژنەکەی کردیە ژوورێکەوەو دەرگای لەسەر داخستو بەجێی هێشت .... شەوێکی ئەوەندە تاریك و بەسام بوو لەترسا لەژوورەوە هەر ئەی ووتوو .... وو ...وو ....وو... نەخێر ئەوەندەی ووت وو.... وو...وو... هەتا غیرەتی پەیدا کردو ترسی شکاو هەستی کرد لەهیچ ناترسێ. بەیانی کە ژنەکەی لەخەو هەستا پێی ووت:

_ (( ئادەی ئافرەت چنگێ ئاردو سێ هێلکەم بۆ بێنە )).

ئەمانەی بۆ هێناوچوە ئەو گوێ چەمە دووسێ کیسەڵی گرتو خستیە باخەڵیەوەو لێ ی دا ڕۆیشت. هەر ڕۆیشت ...

هەر ڕۆیشت هەتا گەیشتە بنار شاخێك. بینی دوو دێو لەپاڵ ئەشکەوتێك دا لێ ی کەوتوون. کەچاویان پێی کەوت بەسەریدا نەڕاندیانو وتیان:

_ (( ئەوە چۆن ئەوێریت بێیتە ولاتی ئێمە؟)).

ئەویش خۆی لێ گیف کردنەوەو پێی ووتن:

_ (( بۆ ناوێرم, خۆ لێتان ناترسم... بەزلی نیە بەمێشکە )).

ووتیان: (( چۆن؟)).

_ ((چاك!)).

_ (( باشە تۆ کێیت؟)).

_ (( من شا عەزیزم!)).

_ (( کوڕە تێپەڕە با نەت فلیقێنینەوە!)).

پتر لێ ی چوە پێشەوە ووتی :

_ (( دەوەرن گرەو بکەین بزانین کێمان هونەرمان زیاترە )).

ووتیان:

_ ((باشە!)).

_ (( من نتوانم بەرد بەجۆرێك وورد بکەم ئاردی لێ پەیدا بکەم , نا بزانم ئێوە ئەمەتان پێ ئەکرێ؟)).

دێوەکان پڕیان کرد بەتاشە بەردێك دا لەناو دەستیاندا وردو خاشیان کرد, کە بۆنیان کرد ووتیان:

_ (( ئای خۆ بۆنی ئاردی لێ نایەت )).

عەزە ترسنۆك بەدزیەوە چنگە ئاردەکەی لەباخەڵی دەرهێناوچنگێك لەبەردە وورد کراوەکەی ئەوانی هەلگرتو تێ ی هەڵسوو و پێ ی ووتن:

_ (( بەخوا باوکم ڕاست ئەکات )).

دوایی پێ ی ووتن: (( ئادەی ئەو درەختە بگوشن بزانم گووی سپیو زەردی پێ ئەکەن؟)).

باوەشیان بەدرەختەکەدا کردو لە ڕەگو ڕیشە دەریان هێنا بەلام هیچی لێ پەیدا نەبوو. عەزە ترسنۆك باوەشی کرد بەدرەختە لەڕگو ڕیشە دەر

هێنراوەکەدا و لەهەمان کاتدا هێلکەکانی پێدا شکاندو تێی هەڵسوو و بەدێوەکانی ووت:

_ ((سەیرکەن من چۆن گوی زەردو سپیم پێکرد؟)).

پێیان ووت: (( وەڵڵا باوکم ڕاست ئەکەیت,باوەڕت پێ ئەکەین )).

دوایی عەزە ترسنۆك ووتی:

_ (( ئابزانم ئێوە ئەسپێی چۆن لەلەشتاندایە؟)).

دێوەکان خۆیان خوراند ئەسپێی ئەوەندەی بۆقێکیان دەرهێناو پێیان ووت:

_ (( لەمەدا ئێمە سەر ئەکەوین !)).

عەزە ترسنۆك دەستی کرد بەبەر باخەڵی دا کیسەڵەکانی دەرهێناو ووتی:

_(( ئەسپێی من ئاوەهان(...)).

کیسەڵەکانی خستە سەر ئەسپێی دێوەکان پانیان کردنەوەو بەرەو دەوەنەکان خشانو وون بوون. دێوەکان ترسانو

پێ یان ووت:

_ ((لامان بهێنەرەوەو بمان پارێزە , چیت ئەوێ ئەت دەینێ !)).

ووتی : ((باشە !)).

پاش ماوەیەك چوون بۆ ڕاوو , کەهاتنەوە پێیان ووت:

_ (( وا ئێمە خواردنمان پەیدا کرد ... دەتۆش ئەو کوندانە هەڵگرەو بڕۆ ئاومان بۆ بێنە )).

عەزە ترسنۆك ئەوی لەکوندەکان ئەوەندە قورس بوون بەبەتاڵیش نەی ئەیوانین, ئینجا ئیتر چۆن ئەتوانێ بەپڕی هەڵیان گرێت؟... بۆیە پێی ووتن :

_ (( پاچو خاکەنازێکم بۆپەیدا بکەن بەبێ کوندە ئاوتان بۆ ئەهێنم )).
بڕوایان نەکرد, بەڵام چوون پاچو خاکەنازێکیان بۆ هێنا....چوە لای جۆگە ئاوەکە, جۆگەیەکی هەڵبەستو ئاوەکەی بەرەو ڕوو هێنا ... بەجارێک سەریان سوڕما . دوایی پێیان ووت:
_ ((باوکم هیچمان بۆمەکەو دانیشە, نوقمی ئاومان مەکە!))
شەوێ کەنوستن تەکبیریان کرد تێری لێ بدەن, چاوترسێنی بکەن. عەزەترسنۆك گوێی لێ یان بوو, بەدزییەوە هەستا کۆتەرە دارێکی خستە جێگاکەی خۆیەوەو دای پۆشیو خۆی لەپەنایەکدا شاردەوە. ئەوەندەی پێ نەچوودێوەکان یەکی بە گورزێکەوە هاتنە وێزەی جێگاکەیو ئەوەندەیان لەکۆتەرە دارەکەدا ئارەقی شینو مۆریان کردەوە ئەوسابەجێیان هێشتو ووتیان:
_((بەخوا چاك گیانیمان دەرکرد... زینوو نابێتەوە)).
کەدێوەکان نوستن عەزەترسنۆك لە پەناکەی هاتەدەرەوەو لەجێگاکەی خۆیدا لێ ی نوست. بەیانی لەگەڵ دێوەکان هەستا, تۆزێك خۆی کێشایەوەو ووتی: (( وا دیارە ئەشکەوتەکان سەربانەکەی کون کونە بۆیە ئەمشەو تەرزە لێ ی داومو کەمێك لەشم کوتراوە!)).
دێوەکان حەپەسانو لەدڵی خۆیاندا ووتیان:
_((ئای هاوار بەماڵمان.... ئەم هەمووو گورزەی بەتەرزە زانیوە؟ بەخوا ناتوانین چاری بکەین!)).
دوایی پێیان ووت:
_((بەخوا باوکم ئێمە لەگەڵ تۆدا هیچمان پێ ناکرێت... ئێستا یەك تورەکە لیرەت ئەدەینێو وازمان لێ بێنەو بڕۆ!)).

ووتی: ((باشە!)).

تورەکە لیرەی هەڵ گرتو لێ یدا ڕۆیشت.

زۆری پێ نەچوو ئامۆزایەکی دێوەکان هات بۆلایان و باسەکەیان بۆ گێڕایەوە, هەندێك پێیان پێکەنی و پێی ووتن: _((ئای قوڕتان بەسەر بۆ خۆتان و ئەقڵتان, ئەوە عەزەترسنۆکەو گاڵتەی پێ کردوون... ئەوە ئەوەندە ترسنۆکە شەو ژنەکەی لەگەڵی نەچێ بۆ میزکردن نەیکاتە ژێرخۆی!)).

باوەڕ یان پێ نەکردو لەسەر قسەی خۆیان سوور بوون و هەر ئەیانووت پاڵەوانێکی گەورەو ڕاستەقینەبوو, بەردی ئەکردبەئاردو گوی زەردو سپی بەدرەخت ئەکرد)).

ئامۆزاکەیان ووتی:

_((ئەگەر باوەڕ ناکەن وەرن لەگەڵمدا ئەچین تاقی ئەکەینەوە)).

ووتیان:

_(( بەخوا نایەین... ناوێرین!)).

_((دەباشە گورزێك ببەستن بەملمەوەو دووراودوور دوام کەون بابەچاوی خۆتان ببینن چۆن پاڵەوانێکە)).

گوریسێکیان کردە ملی, یەکێکیان سەرەکەیتری گوریسەکەی گرت و دوای کەوتن. کەگەیشتنە ماڵی عەزەترسنۆك ئامۆزاکە هاواری کرد:

_(( ئادەی عەزەترسنۆك وەرە دەرەوە بابزانین چۆن پاڵەوانێکیت!...)).

عەزەترسنۆك کەزانی دێوەکان هاتوون هاواری کردە ژنەکەی:

_((ئادەی ئافرەت ئەو دێو ترێنەم بۆبهێنە!)).

سێ دێوەکە کەگوێیان لەمەبوو لەترسا ئاگایان لەخۆیان نەماو ڕایان کرد... ئەوەی سەری گوریسەکەی بەدەستەوە بوو لەهەموویان بەپرتاوتر

ڕایکرد... ئەوەندە لەپڕ قەڵەمبازیدا سەری دێوەکەی ئامۆزای هەڵکەندو هەتا ئەشکەوتەکە نەوەستایەوە. کەسەری ئامۆزاکەیان بەوجۆرە بینی بەگوریسەکەوە ووتیان: (( دەبخۆ دەی... ئەوە ئەنجامی دەم درێژیو باوەڕنەکردنت)).

ئیتر نەیان وێرا لەو ناوە بمێننەوەو باریان کردو عەزەترسنۆك ڕزگاری بوو و،

**منیش هاتمەوە هیچیان نەدامێ.**

# ((هەپووش))

**ئەم چیرۆکە لەساڵی١٩٥٤دا لەدەمی خوشکەفەخریە ئاوە چاوەش، کەخوشکێکی مەسیحی یە وەرگیراوەوسەرلەنوێ داڕێژراوەتەوە، زۆر جێگەی سوپاسە.**

**جەلال تەقی**

هەبوو... نەبوو... پیاوێك هەبوو، کەمرد کوڕێکی کەچەڵی بەدخووی بێ کارو هەژاری بێکەسی لەپاش بەجێ ما.کەسێ ڕۆژە تەواو بووکەچەڵەبەدایکی ووت:

_((وادیارە ژێر قنگ پڕەو میراتی باوکم هەمووی لای تۆیە، چی لەپاش جێ ماوە بمدەرێ )).

دایکەی بەسەزمان هەرچەند هاواری کرد کەهیچی لەپاش بەجێ نەماوە نەیئەبیستو نەختێکیشی لێ نەدا. ناچار پاچەکۆڵەیەکی دایەو پێی ووت:

_((باوکت تەنها ئەم پاچەی هەبوو کەخۆیو ئێمەی پێ ئەژیاند، هابیبە)).

کەچەڵە پاچەکەی هەلگرتو ڕۆیشت... کەلەو دەشتە دای لەزەوی کونێك دەرکەوت... کەدەرکی کونەکەی گەورەکرد پلیکانەیەکی بەدی کردو پیایدا چووە خوارێ. چی بینی!، باخو باخاتێك بوو سەد دڵی لێ ئەحەسایەوە. هەرچەندە دنیا زستان بوو و گەڵای سەوز نەمابوو بلام ئەو باخەپڕبوو لەگوڵو درەختی سەوزوبەردار. پاش گەڕان دار هەنجیرێکی بینی هەنجیری

پێودبوو یەکی ئەوەنـدەی مستەکۆڵەیەك ئـەبوو. ئەمـەی زۆر لاسـەیر بـوو, پـڕی پێداکردودانەیــەکی لێکـردەوە, کەقـەپاڵێکی لێ گـرت یەکسـەر بــوو بەکەرێك‌و لەوناوەدا دەسـتی کـرد بەهەڵتیزانـدن‌و زەڕەزەڕ. لـەدڵی خـۆیدا ووتی: ((ئای چیم کرد بەخۆم!)).

ماوەیـەکی تـر گـەڕا دار هـەنجیرێکی تـری بینـی هـەنجیری پێوەبـوو یـەکی ئەوەندەی دەنکە نۆکێك بوو. لەدڵی خۆیدا ووتی:

_((با لەمەش بخۆم, بزانم ئەمە ئەمکات بەچی!)).

هەر کەخستیە دەمیەوە بووەوە بەکوڕەکەی جاران. بـەخۆی ووت: ((بـەخوا شتی چاکە !)).

هاتـە دەرێ سـەری کونەکـەی گرتـەوەو شـوێنەکەی نیشانەکردو ڕۆیشـتەوە ماڵێ. بەدایکی ووت:

_((دایە, بەیانی زوو بچۆ خوازبێنی کچی پادشام بۆبکە!)).

دایکی چەپۆکێکی پێداکێشاو ووتی:

_((هـەتیو ووسـبە, دارو دیـوار گوێیـان هەیــە, سـەرمان بەفەتارەتێکـدا مەدە!))

دایکی ووتی‌و ئەو نەیبیست. ناچار ڕۆژی دوایـی چـوو بـۆ کۆشـکی پادشـاو لەشوێنی خوازبێنی کـەران دانیشـت. پادشـا چاوی پـێ کـەوت بەنۆکـەرێکی ووت:

_((ئەو سوالکەرە نەشارەزایە, شتێکی بدەنێ بابڕوات)).

شتێکیان دایەو دەریانکرد.

کەهاتـــەوە مـــاڵێ کەچـــەڵە ئەوەنـــدەی لێـــدا شـــل و کـــوتی عـــەمری کـــردو بۆســـبەینێ دووبـــارە ناردیـــەوەو پـــێ‌ی ووت: ((ئـــەمڕۆ پێـــیان نـــەڵێ ی نەتکوژم)).

هەرکەگەیشـــتەئەوێ‌و باســـەکەی درکانـــد ئەوەنـــدەیان لێ دا لـــەخوێنیان هەڵکێشاو ڕەوانەیان کردەوە. بەهەزارحاڵ خۆی گەیاندەماڵەوە.کەکەچەڵە بەوجۆرە بینی ووتی: ((پادشا ڕاوەستە بۆم, مەرج بێ بتکەم بەکەرو تۆڵەی دایکمت لێ کەمەوە!)).

دایکـــی کەبـــەحاڵ نـــووزەی تێـــدابوو, پـــێ‌ی ووت: ((کوڕەبیکـــە بۆخـــاتری پیاوچاکان لەگەڵی شەیتان وەرە خوارێ‌و وازبهێنە, لێ یان داوم چش!...)).

بەگوێ‌ی نەکرد. قاپێکی هەڵگرت‌و چووەوە باخەکەی ژێـر زەوی. قاپەکـەی پڕکـرد لـەهەنجیرە گـەورەکان, خاولیـەکی سپی پێـداداو چـەند دانەیەکیشی لەهـەنجیرە وردەکـە خستە گیرفـانی‌و هـات بۆمـاڵی پادشا. بەیاسا وڵەکانی ووت: (( عـەرزی پادشـا بکـەن دیـاری یـەکم بـۆ هێنـاوە هەرگیزشـتی وای نەدیوە)).

داواکاری‌یەکەیان بەپادشا ڕگەیانـدو کەفـەرمانی دا بێـت کردیانـە ژوورەوەو چـووە لای پادشـا. بـەڕێزەوە خـاولی یەکـەی لابـردو قاپـە هەنجیرەکـەی لەبەردەم پادشادا داناو ووتی: (( فەرموو پادشام هەنجیرێك بخۆ )).

پادشـا واقـی وڕمـا کەبـەو زسـتانە هـەنجیرە تـازەی واگـەورە ببینـێ‌و زۆر بەتاسوقەوە دانەیـەکی هـەڵگرت‌و خستیە دەمیـەوە , هەرکـە دانـی پیادانـا پادشـا کەکســەر بوبــە کــەرو کەوتــە زەڕە زەڕ. لەدوایيـــدا هاتەقســـەو بەگریانەوە ووتی:

_ (( بۆخاتری خوا چیت ئەوێت ئەتدەمێ چاکم بکەرەوە !)).

کەچەڵە پێی ووت:

(( کچەکەتم بدەرێ چاکت ئەکەمەوە !)).

_ (( وەی بەسەر چاو، مرج بێت ئەتدەمێ !)).

کەچەڵە هەنجیرێکی بچوکی لەگیرفانی دەر هێناو خستیە دەمیەوەو ووتی ((بیخۆ!)).

هەر کە خواردی بودود بە پیاود کەی حاران!

کەچەڵە پێی ووت

_ (( دە پاشا کچە کەتم لێ مارە بکە !)).

_ (( بەسەرچاو , بەڵام پێم نالێ ی ئەم شتە سەیرەت چۆن دەست کەوتوە؟)).

_ (( بەپاچێك!)).

_ (( ئادەی بچۆ بیهێنە , هەتا تۆ دێ یتەوە هەموو شتێك ئامادە ئەکەین!)).

کەچەڵە بڕوای پێکردو بەهەڵە داوان چوو پاچە کۆڵەکەی هێناو دای بە پادشا . پادشا فەرمانی دا تێیان کوتاو دەریان کردە دەرەوە .

بەسەری شکاوو قنگی دڕاوەوە چوەوە ماڵەوەو بەدایکی ووت:

_ (( دایە گیان , باوکم هیچی تری لەپاش بەجێ نەمابوو؟)).

دایکی ووتی:

_ (( بەخوا ڕۆڵە زوڕنا شکاوێکیشی هەبوو بزانم بۆم ئەدۆزرێتەوە !)).

لەبوخچەیەکدا زوڕنا شکاوەکەی دۆزی یەوەو دایە دەستی.

کەبەتەنها مایەوەو فووی پێدا کرد کۆمەڵێك جنۆکەی لەدەور خڕ بودودو پێیان ووت:

_ (( فەرمووو چیت ئەوێت ؟)).

ووتی : (( کۆشکی پادشام بۆ تێك بدەن !)).

جنۆکە دەستی کرد بەتێك دانی کۆشكو کەچەڵەش چوو بۆ سەیر کردنی . ئەوەندەی بڵێ ی یەكو دوو نهۆمی سەرەوەیان تێك داو بەردیان بەسەر بەردەوە نەهێشت . پادشا بەحەبەساوی یەوە هاتە دەرێ , کە کەچەڵە چاوی پێ ی کەوت لەدوورەوە هاواری کرد:

_ (( پادشا خۆچاوت لێ یە چیم پێ کردی .... کچەکەتم بدەرێ کۆشکەکەت بۆ چاك ئەکەمەوە)).

پادشا سوێندی بۆخوارد کەکچەکەی بداتێو پێ ی ووت:

(( کوڕی خۆم جاری پێشوو گاڵتەم لەگەڵکردی ئەگینا لەو ڕۆژەوە کچەکەمم بۆ داناویت )).

کەچەڵە باوەڕی پێکردو فووی بەزوڕناکەدا کردو بەجنۆکەکانی ووت: کەکۆشکەکە دروست بکەنەوە .

کەچەڵەیان بردە ژورەوەو لای پادشاوە دایان نا .

پادشا پێ ی ووت:

_ (( بەخوا تۆ زۆر زیرەکیت ... ئەم ئیشەت چۆن کرد ؟)).

کەچەڵە بەشانازی یەوە پێ ی ووت :

_ (( ئەم زوڕنایە!)).

پادشا بەفێڵ ئەویشی لێ سەندو بەشەق دەری کردە دەرەوە.

دەورو پشتەکەی پێیان ووت:

_ (( پادشا, بۆچی نایکوژیتو ڕزگارت بێت؟)).

پادشا وەرامی دایەوە : (( نەء , ئەم کەچەڵە شتی زۆرە , بەرە بەرە هەمووی لێ ئەسێنین‌و ئەوسا کوشتنی ئاسانە !)).

کەچەڵە دووبارە چوە ماڵێ‌و بەدایکی ووت:

_ (( باوکم چی تری لێ بەجێماوە بمدەرێ )).

دایکی ووتی: (( بەخوا تەنها کڵاوێکی ماوەو هیچی تر!))

کڵاوە شڕێك لەسندوقێك دەرهێناو دای بەکەچەڵە . کەکردیە سەری غەیب بوو, بەخۆی ووت:/

_ (( بەخوا شتی چاکە!))

چوە ماڵی پادشاو دەستی کرد بەنوقورچ لێ گرتن‌ونەزیەت دانی کچی پادشا . کچەی بەستەزمان هەر هاواری ئەکردو کەسیش نەی ئەزانی هۆی چی یە. حەکیمی شاریان بانگ کرد کەڵکی نەبوو . پادشا ووتی : ((فریای کچەکەم بکەون

... کێ بتوانێ لەم بەڵایە ڕزگاری بکات هەرچی بوێ ئەیدەمێ )).

کەچەڵە خۆی پیشان داو ووتی :

_ (( پادشا , من وام لێ کردوەو هەر منیش ئەتوانم چاکی بکەمەوە !)).

بازۆر سەرتان ئەیەشێنم , بەفێڵەکەی پێشوو کڵاوەکەشیان لێ سەندو بەلێدان دەریان کردە دەرێ . هاتەوە لای دایکی‌و

داوای میراتی تری کرد . دایکی هیچی نەمابوو بیداتێ . کەچەڵە ووتی :

_ (( دەکەواتە ئەچم شکات لەپادشا ئەکەم !)).

دایکی وای زانی شێت بوەو دەری کردە دەرەوە.

کەچەڵە هاواری بردە لای پادشای شارێکی دراوسێیان‌و باسەکەی هەموو بۆ گێڕایەوەو داوای یارمەتی لێ کرد . ئەو

پادشایە نامەیەکی دایە بۆ پادشای شارەکەی خۆیان کەتیایدا نوسیبوو مەرجی پادشایان بەو جۆرە نابێ‌و نابێ لەقسەی خۆی پەشیمان ببێتەوە , لەبەر ئەوە پێویستە کچەکەی بداتێ .پادشا دەستێکی کەوتە ئەم لاو دەستێکی کەوتە ئەولا , وەرامی پادشاکەی دایەوە ووتی: (( جەنابی پادشا , یەك مەرجم هەیە , لەسەر تۆدا بەجێی بهێنێ کچەکەمی ئەدەمێ : من کۆمەڵێك بەرانە کێویم هەیە , ڕۆژێك لەو دەشتە بۆم بلەوەڕێنێ‌و بۆم بهێنێتەوە ئەیکەم بەزاوای خۆم )).

کۆمەڵە بەرانە کێویە کانیان دا بەکەچەڵە . هەرکە لەپشتیرەکە هاتنە دەرێ هەریەکە بەلایەکدا ڕایان کرد و کەچەڵە

دوایان کەوت هەتا دەرەوەی شارو لەوێ لەچاوی ون بوون .

دانیشت‌و دەستی کرد بەگریان . زۆری پێنەچوو گوێی لە فیشکە فیشك بوو, بینی دووماری ئاشقەوماشقە لەیەك ئاڵاون‌و خەریکی کاری خێری خۆیانن. کەچەڵە زۆر ترساو پەستەکە شرەکەی داکەندو دای بەسەریاندا . یەکێك لەمارەکان هاتە قسەو ووتی : (( ئەی ئادەمیزاد لێمان تێك مەدە , چیت ئەوێ بۆت ئەکەین ئەو شتەمان لەسەرلابەرە !)).

کەچەڵە ووتی: (( ئەمەوێ ئەو کۆمەڵە بەرانە کێویەم بۆبگرنەوە!)).

هەرکە ووتی: (( هەپووش)) بەرانە کێویەکان هەر یەکەیان لەلایەکەوە هاتنەوەو لەبەردەمی دا وەستان , ئەویش بەدڵخۆشیەوە بەرەو ماڵی پادشای بردنیەوە. پادشا بەجارێك واقی وڕما , چونکە کەس نەی ئەتوای ئەو بەرانەکێوی یانە

.

ببات بیان لەوەڕێنیٚو بەکۆمەڵ بیان هێنێتەوە . ناچاریش بوو ئەبوایە ئەم جارە بەلێنەکەی بەجێ بهێنایە. ناردی بەشوێن کچەکەیداو پێی ووت:

(( کچی شیرینم , چارم نیە ئەبێ بتدەم بەم کوڕە )).

کچی پادشا گریاو ووتی:

_ (( بابە گیان من شوو بەمە ناکەم)).

باوکی دڵخۆشی دایەوەو دەستی هێنابەسەریدا کەڕازی بکات لەوکاتەدا کەچەڵە لەدڵی خۆیدا ووتی هەپووش ,دەستی پادشا بەسەری کچەکەیەوە نوساو هەرچەندە دەستی ڕاپسکان لێ ی نەبوەوە . یەك دوانێك پادشایان ڕاکێشا بەهەپووش

ئەوانیشی یەك بەدوای یەکدا نوساند بەپادشاوە . کچی پادشا کەئەمەی بینی گریاو کەوتە هاوار هاوار , کەچەڵە ووتی :

(( هەپووش)) دەمی بەکراوەیی مایەوە مێشی تێ ئالآ.

پادشا هاواری کرد: (( ئا یەکێك بچێت بەشوێن مامۆستادا بابێت دۆعایەك بخوێنێو لێکمان بکاتەوە )).

کەچەڵە ووتی : (( خۆم ئەچم بانگی ئەکەم!)).

چوو بۆلای مامۆستاو مەسەلەکەی تێ گەیاند . مامۆستا کتێبو شتی پێویستی خستە سەر کەرێكو خۆشی ویستی

سواری بێ , قاچێکی گەیشتە سەر پشتی کەرەکەو قاچەکەی تری هێشتا لەزەوی بوو کەچەڵە ووتی : (( هەپووش))و

مامۆستا قاچی بەپشتی کەرەکەوە مایەوەو بەهەنگە شەلە کەچەڵە مامۆستاو کەرەکەی بەرەو کۆشکی پادشا برد.

کەخۆیان کرد بەدیوەخاندا مامۆستا هاواری کرد : (( پادشا خراپم لێ قەوماوە فریام کەوون)).

پادشاو ئەوانی تر حەپەسان.

پادشا هاواری کرد:

_ (( بچن داپیرە جادوگەر بانگ بکەن , ئەم کارە بەو نەبێت چارناکرێت )).

دووبارە کەچەڵە ووتی من ئەچم‌و چوو بۆلای داپیرەی جادوگەرو مەسەلەکەی تێگەیاندوهێنای.

لەرێگا بەکۆلانێکدا بردی جۆگەلەیەکی پان‌و قوڵی پێدا ئەرۆیشت کەچەڵە پێی ووت:

_ (( داپیرە گیان خۆ ئێرە کەسی لێ نیە, بۆ ئەوەی جلەکانت تەڕ نەبێت کراسەکەت هەڵکە)).

داپیرە ووتی: کوڕی خۆم کراسەکەشم هەڵکەم خۆ , عەیب نەبێت , ئاوەڵکراسەکەم هەر تەڕ ئەبێت !)).

_ (( داپیرە گیان ئەویش داکەنە , کەس دیار نیەو منیش وەك کوڕت وام!)).

بەم جۆرە دەرپێکەی بەداپیرە داکەند بۆ ئەوەی لەجۆگەکە بپەڕێتەوەو تەڕ نەبێت . هەرکە کراسەکەی هەتالای ناوکی هەڵکرد کەچەڵە ووتی : (( هەپووش)) و کراسەکە بەو جۆرە مایەوەو کەلەجۆگەکە پەری یەوە هەرچەند هەوڵی دا بۆی دانەدرایەوەو دەرپێکەی بۆ لەپێنەکرایەوە. پاش ئەوە ناچاربوون بەجێگایەکی قەڵە باڵەغدا بڕۆن . سەرخۆشێك

بەرانبەریان هاتو ئەم دیمەنەی زۆرلاسەیربوو , کەگەیشتە پیرێژنەکە شلێپکی دا لەدواوەی‌و ووتی:

_ (( ئای لەو قنگە چرچو ڕووتە!)).

هەرکە دەستی بەر پیرێژنەکە کەوت کەچەڵە ووتی : ((هەپووش))و پەنجەیەکی پێوە نوسا . پیرێژن ڕایکردو سەرخۆشەکە بەدوای دا! لەدوای یدا سەرخۆشەکە هیچی بۆنەمایەوە چەقۆیەکی لەباخەڵی دەرهێناو پەنجەکەی بڕیەوەو خوێن فیچ قەی کرد . لەوکاتەدا کەڵە شێرێك خوێنەکەی بەدی کردو خۆی بۆهەڵدا کەتکەیەك بخواتەوە .

هەرکە دەنوکی گەیشتە جێی پەنجە بڕاوەکە کەچەڵە ووتی : (( هەپووش))و کەڵە شێرەکەی پێوە نووسا, پیرێژن ڕای ئەکردو کەڵەشێرکە بەفرکەفرك بەدوایدا هەڵواسرابوو , بەم دیمەنە سەیرەوە خۆیان کرد بە دیوەخانی پادشادا .

کەلەدیوەخان پیرێژنی نیوە ڕووتو کەڵە شێرەکەیان بینی بالی ئەدا بەیەکداو بەدوایەوە فڕکە فڕکی بووحەپەسان.

پادشا هاواری کرد : (( بۆخاتری خوا ئەمەچی حاڵێکە ؟... کێ ئەتوانێ ڕزگارمان بکات ؟...)).

کەچەڵە ووتی:

_((پادشا تەنها من ئەتوانم ڕزگارتان بکەم, لەگەڵی شەیتان وەرە خوارێ‌وکچەکەتم بدەرێ ڕزگارتان ئەکەم )).

پادشا سوێندی خوارد کەئەمجارە نایخەڵە تێنێ‌و کچەکەی لێ مارە ئەکات.

کەچەڵە بە ((هەپووش)) لەیەکی کردنەوەو پادشا پێی ووت:

_((ئای کوڕی شیرینم بزانم بەچی ئەمانەت ئەکرد؟)).

وەلامی دایەوە: ((پادشام ئەمەیان شتێك نی یە وەك ئەوانی پێشوو لێم بسەنیت, ئەمەشتێك نیە بدرێتو تایبەتە بەخۆمەوە!... نیتر فێڵو فەرەج سەرناگری!....)).

پادشا ناچاربوو هەر لەوێدا کچەکەی لێ مارەکردو, کەچەڵەخۆی گۆڕیو جلی باشی لەبەر کرد بووبەکوڕێکی ترو لێ هاتوو. حەوت شەوو, حەوت ڕۆژ دایان لەتەقەی دەهۆڵو زوڕنا

**منیش هاتمەوە هیچیان نەدامێ.**

# ((پاشاکوێرەو مەلی هەزارە))

**تـەموزی١٩٨٠لـەدەم فەیمـەی حەسـەن فەرەجـەوە نوسـراوەتەوە کـەژنێکی نەخوێندەواری پەنجا ساڵەیەونێستا لەکارگەی جگەرەی سلێمانی کرێکارە.**

**جەلال تەقی**

هەبوو... نەبوو... کەس لەخوا گەورەتر نەبوو، کەس لەبەندەی خـراپ ڕوو ڕەشـــتر نـــەبوو، پادشـــایەك هـــەبوو ســـێ کـــوڕی هـــەبوو: ئەحمەدومحەمەدومـەحمود. پادشـا تەمـەنێکی درێـژی بەسـەر بردبـووو لەوناخرو ئۆخری تەمەنەیدا هەردووچاوی کوێربوو بـوو، بـاخو باخـاتێکی هەتابڵێی فراوانی هەبووبـەلام نـەهاتبووە بـەر. زانایـان ڕەملیـان بۆهەڵداو ووتیان: ((پادشامان، ئەگـەر مـەلی هـەزارەی پەیدابکەیتوبەسـەرباخەکەتدا بخوێنێ دێتە بەرو خۆشت چاوت چاك ئەبێتەوە)).

پا دشا هەر سێ کورەکەی بانگکردو پێی ووتن:

_((ڕۆڵەکانم ... شتێکی وام پێویستە ،لەئێوەش دڵسۆزترم نـی یـە، ئینجا بزانم کامتان فریام ئەکەونوبۆم پەیدانەکەن؟)).

ئەحمەد کەکوڕەبچۆلەبوو, هاتە قسەو ووتی: ((بابەگیان, ئەگەر بفەرمووی من ئەڕۆم بەدوایدا, یان سەرم دائەنێم یان بۆت دێنم)).

محەمەدومەحمود هاتنە قسەو پێ یان ووت:

_(( برۆبەولاوە بەدفەساڵەی چڵمنە, گەڕی وەك تۆ کاری وا گرانی چۆن پی ئەکرێ ؟ ئەمە کاری مندالآن نیە!)).

ئەحمەد بەدڵ شکاوییەوە لەدیوەخان هاتە دەرێ ...براکانی ئەسپیان زین کرد, پڕ خورجی یەك زێڕیان هەڵگرتو لێ یاندا ڕۆیشتن.

کەئەوان لەچاو وون بوون ئەحمەد چوەلای پادشاو پیٚی ووت: ((بابەگیان, هاتووم بۆ خزمەتت داواکاری یەکم هەیە, دەست مەنێ بەڕوومەوە!)).

وەڵامی دایەوە: ((بڵێ چیت ئەوێ کوڕم!)).

_(( بابەگیان, ڕێگام بدە منیش بچم بەدووی مەلی هەزارەدا, بەڵکو دەستم بکەوێ!)).

باوکی ڕێگای‌دا. ئەحمەد چووە تەویلەکەوە ئەسپێك هەڵبژێرێت, ئەمەندە بەهێز بوودەستی ئەخستە سەر پشتی هەر ئەسپێك لەژێر دەستی دا ئەچەمایەوە, هەتا لەدوایی دا دەستی خستە سەر پشتی ئەسپێك نەك هەرپشتی نەئەنوشتایەوە, بەڵکو خۆی بەرزکردەوە, ئەحمەد بەسەر مەیتەرەکەی ووت: ((ئەم ئەسپەم بۆزین بکە!)).

تفاقی ئامادەکرد, دۆعاخوازی‌کردو سواری ئەسپ بوو... هەر کە ئاوزەنگی لێدا ئەسپەکە ئەوەنەبوو باڵ بگرێ.... زۆری پێ نەچوو گەیشتە ئەودیو شاخەکە.

محەمەدو مەحمود ئاوڕیان دایەوە تەپو تۆزیان لەدوورەوە بینی وتیان: ((سوارێکمان لەدواوەیە, بابوەستین بزانین چ باسە!)).

کەئەحمەد گەیشتە لایان هەندێك قسەیان پێ ووتو ووتیان: ((ئێمە دانومان لەگەڵ تۆدا ناکوڵێ, ئەبێ لەیەکتری جیاببینەوە!)).

ئەحمەد وەڵامی دایەوە: ((باشە براینە, بەڵام باهەندێك بەیەکەوە بڕۆینو دوایی لێتان جیائەبمەوە)).

زۆر نەڕۆیشتن بینیان ڕێگاکە بوو بەسێ ڕێگا, لەیەکێکیان نووسرابوو ڕێگای هاتو نەهات, لەوی تریان نوسرابوو ڕێگاینەهات, لەسێهەم یان نووسرابوو ڕێگای هەر گیز نەهات, بەئەحمەدیان ووت:

_(( تۆ ئەبێت بەڕێگای هەرگیز نەهاتدا بڕۆیتو ئێمەش هەر یەکێکمان ڕێگایەکی تریان ئەگرینەبەر!)).

ئەحمەد ووتی: ((باشە. بەڵام بالەم شوێنەدا ئەموستیلەکانمان بشارینەوە, هەرکاممان مەلی هەزارەی پەیداکردو زووتر گەڕایەوە چاوەڕێی ئەوانی تر بکات, باشتر وایە هەمووومان پێکەوە بگەڕێنەوە )).

لەژێر بەردێکدا شاردیانەوەو نیشانەیان کردو لێ یاندا ڕۆیشتن. محەمەد هەر ڕۆیشت... هەر ڕۆیشت هەتا گەیشتە شارێك. لەدڵی خۆیدا ووتی:

_(( چەند وەختە من هاتووم نەگەیشتوومەتە هیچ ئەنجامێك ڕەنگە هەر نەشگەمە ئەنجام... بەخوا واچاکە لەم شارەدا بمێنمەوە, دیارە شتی واگران بەمن پەیدا ناگرێ... بەدەستی بەتاڵیش شەرمە بگەڕێمەوە, کەواتە بالێرە بمێنمەوە)).

لەوشارە باری خستو ماوەیەك بێ کارو دانیشتو هەر پارەیەکی پێ بوو خەرجی کردو بەفیڕۆیدا, هەتا لەدوایی دا ناچار بوو بەخەڵوز فرۆش.

سەرتان نەیەشێنم... بەهەمان شێوە مەحمودیش بووبە نارد فرۆش.

بێ ینەوە سەرەوکاری ئەحمەد . هەر ڕۆیشت... هەر ڕۆیشت... هەتا گەیشتە پیرەمێردێکی ریش تۆپزیی نوورانی, پێی ووت:

_(( ها, ئەحمەد پاشا... ئۆغر بێت؟))

_(( کەئەزانی ناوم ئەحمەدە ئەبێ بشزانیت بۆکوێ ئەچم!)).

_(( نێ ئەحمەد!... ئەوەی تۆ بۆی ئەچیت ماوەی سەد ساڵ لێرەوە دوورە!... بەڵام یارمەتیت ئەدەم... پاش ماوەیەکی تر ئەگەیتە ئەشکەوتێك دەڵە دێوێك لەبەریدا دانیشتووە نان ئەکات... مەمکەی چەپی داوە بەسەرشانی ڕاستی داو مەمکەی ڕاستی داوبەسەر شانی چەپی دا .... لەپشتەوەبەدزیەوە مەمکی ڕاستی بمژە, بەڵام نەکەی لێت تێك بچێتومەمکی چەپی بمژیت ئەگینا ئەتکات بەناردو لەگەڵ هەویرەکەی بەردەستی دا ئەت شێلێ... ئەوسا توند باوەشی پێدا بکەوبڵێ: دایەگیان بمکە بەکوڕی خۆت. هەرچی بڵێت بەرەڵای نەکەیت هەتا ئەڵێ((باشە واکردمی بەکوڕی خۆم)), ئەوسا بەسەرهاتەکەی خۆتی بۆ بگێڕەوە یارمەتیت ئەدات!)). پیرە مێردەکە ئەمەی ووتو وون بوو.

ئەحمەد هەر ڕۆیشت... هەر ڕۆیشت... هەتا گەیشتە دەڵە دێوەکە...بینی نان ئەکاتو مەمکی داوە بەشانی دا.

بەپێی ئامۆژگاریی پیرەمێردەکە بەدزییەوە لەپشتەوە پڕی پێداکردو مەمکی ڕاستی مژی. دەڵە دێوەکە هاواری کرد: ((ئەی ئادەمیزاد مەمکم بەردە چیت ئەوێ ئەتدەمێ)).

ئەحمەد ووتی: ((دایەگیان بمکە بەکوڕی خۆت)).

وەڵامی دایەوە:

_((چۆن ئادەمیزاد ئەبێ بەکوڕی دێو؟)).

ئەحمەد ووتی:

_((هەتا ئەمکەی بەکوڕی خۆت بەرت نادەم!)).

دەڵە دێوەکە ووتیو ئەو نەیبست, هەتا کردی بەکوڕی خۆیو بردیە ئەشکەوتەکەوەو سەر گوزشتەکەی خۆی بۆ گێڕایەوە. دەڵەدێوەکە پێی ووت:

_((من حەوت کوڕم هەیە بێنەوەو بتبینن ئەتخۆن)).

_((چارچیە؟))

_((هەقت نەبێ!))

زۆری پێ نەچوو حەوت کوڕەکەی هاتنەوە. دەڵەدێوەکە ئەفسونێکی خوێند ئەحمەدی کرد بەگسکێكو لەپەنایەکدا فڕێیدا. کە حەوت دێوەکە هاتنە ژوورەوە لەدوورەوە بانگیان کرد.

_((دایە, بۆن دێ, بۆنی بێگانان دێ, لەم ئەرزو مەکانان دێ... کێت لایە؟)).

_(( ڕۆڵە ئەوەشێت بوون کەسم لانیە)).

بڕوایان نەکردو کەوتنە گەڕان بەکونو کەلەبەری ئەشکەوتەکەدا. کەلەگسکەکە نزیك بوونەوە خەریك بوون پەلاماری بدەن. دایکیان پڕی پێداکردو هەتا هێزی بوو تووڕی هەڵدا, ئەمەندە بەهێز هەڵی دا گەیشتە ئەودیو شاخەکەو لای درەختێکەوە کەوتە سەرزەویو بووەوە بەئەحمەد.

ئەحمەد کەبووەوە بەئەحمەد هەر ڕۆیشت ... هەتا گەیشتە شوێنێك بینی سێ دێو مقۆمقۆیانەوخەریکە لێ یان ئەبێ بەشەڕ. لێ یان چووە پێشەوەو پێی ووتن:

_((ها, ئەوە خێرە وابەیەکدا دێن؟)).

گەورەکەیان ووتی:

_(( ئـەم سـێ شـتەمان دەسـت کـەوتوە نـازانین چـۆن لـەخۆمانی بـەش بکەین)).

لێ ی پرسین: ((ئەم شتانەچین و بۆچی باشن؟)).

_ووتـی: ((ئەمـەیان قالیچـەی حـەزرەتی سلێمان پێغەمبـەرە, سواری بیـت بۆکوێت بوێ ئەتبا. ئەمەیان کڵاوی سەخری جنـە, بیکەیتـە سـەرت غـەیب ئەبیت. ئەمەشیان هەمانە بۆرەیە, هەرداێنیێ و بڵێ خواردن بێت ئـیتر سـەد میوانت هاتبێ هەموویان تێر ئەکاتو هەر چەشـنە خواردنێکت بـوێ بـۆت دێنێ.

ئینجا لەبەر ئەوەی من خێزانم زۆرەو میوانم زۆردێـت هەمانـەبۆرەم ئـەوێ گەچی نامدەنێو ئەڵێن ئێمەش ئەو مانەئەوێ)).

ئەحمەد پێی ووتن: ((من رێکتان ئەخەمو سوڵحتان ئەکەم)).

ووتیان: ((چۆن؟))

وەڵامـی دایـەوە: ((تیرێـک هەڵئـەدەم, هـەرکامێکتان زوو بۆتـان هێنامـەوە هەمانە بۆر بۆئەو)).

ووتیان: ((باشە؟)).

ئەحمـەد تـیری خسـتە بەرکـەوانو هـەتا هێـزی تێـدابوو زێی ڕاکێشـاو هاوێشـتیو دێوەکـان دوای کـەوتن. هـەر دوورکەوتنـەوە ئەحمـەد سـواری قالیچـەکەبوو, هەمانـەبۆری خسـتە سـەروکڵاوەکەی گـرت بەدەسـتیەوەو ووتی: ((لەنیەتی ئەوەی بمگەیەنێتە شاری مەلی هەزارە)).

ئەوەندەی بڵێ ی یەكودوو لەقەراخ شارێك نیشتەوە. کەڕوانی شار لەهـەر چوار لاوە بەشـوورەی بـەرز دەورەدراوە پاسـەوانی پڕچـەك لـەدەرگاکانیدا

وەستاون ناهێڵن مەل بچێتە ژوورەوە. ئەحمەد کڵاوەکەی کردەسەری و غەیب بوو و بەبەردەم پاسەوانەکاندا چووە ناوشار بێ ئەوەی هەستی پێ بکەن.... لەودیوشوورەکەوە کڵاوەکەی داگرت و بەشارەکەدا دەستی کرد بەگەڕان و بەپرسیار کۆشکی مەلی هەزارەی دۆزیەوە کڵاوەکەی کردەسەری و چووەکۆشکەکەوە... گوێی لەدەنگ و ئاوازێك بوو ئەوەندەی نەمابوولەتاودا لەهۆش خۆی بچێت و بەرەو دەنگەکەچوو... کەگەیشتە ئەو ژوورەی دەنگەکەی لێوە ئەهات چی بینی!... پەنابەخوا! کچێك پاڵ کەوتبوو وەك مانگ ئەدرەوشایەوە... قژی بەرامبەر مەلێك پەخشان کردبوو کەلەقەفەزێکدا بەدیوارەکەوە هەڵواسرابوو و مەلەکە لەهەزار ئاواز بۆی ئەخوێند. دەنگی نەکرد هەتا کچەکە خەوی لێکەوت. ئەوسا بەهێواشی هەستا بستێك لەقژەکەی بڕی، خستیە گیر فانیەوەو قەفەزەکەی هەڵگرت و هاتەدەرێ و... سواری قالیچەکە بوو و ووتی: لەنیەتی ئەوەی لەم شارە دووربکەومەوەو بگەمە نزیکترین شار. ئەوەندەی پێ نەچوو لەشارێك نیشتەوە بینی هەمووی لەکەللەسەر دروست کراوە... لەیەکێکی پرسی :

_(( ئەرێ برا ئەم شارە ناوی چیە؟))

_وەلامی دایەوە:

_((ئەمە شاری گوڵ پادشایە!))

لێ ی پرسی:

_((ئەی باشە ئەم هەموو کەللەسەرانە چین؟))

_((بەخوا برا کەس نازانێ... نهێنی یەکەی لای گوڵ پاشایەو تەنها ئەو ئەیزانێ!))

ئەحمەد خۆی گەیاندە کۆشکی گوڵ پادشا... دەستو پێوەندەکانی ڕێزیان گرتو بردیانەلای پادشاو ئەویش میوانداری یەکی باشی کرد. کەکاتی نان خواردن هاتو سینی دانرا ئەحمەد ووتی:

_((پادشام, نمەکت ناکەم ئەگەر پێم نەلێ ی ئەم هەموو کەللە سەرەچیە)).

پادشاووتی: ((کوڕم وازبهێنە... من ئەم نهێنی یە بەهەر کەسێك بڵێم ئەبێ لەسەری بدەم. ئەم کەللەسەرانە هی ئەوکەسانەن کەوەك تۆ داوایزانینی ئەم نهێنی یەیان کردوە, لەبەرنەوە تۆ جوانکەیت واز لەمە بهێنەو نانەکەت بخۆ)).

ئەحمەد ووتی:

_((جەنابی پادشا مەرجەکەتم قوبوڵە!.... پێم بڵێولەسەرم بدەو کەللەکەم بخەرە سەرنەو هەمووکەللانە!)).

_((باشەکوڕم نانەکەت بخۆ پێت ئەلێم)).

کەنانیان خوارد پادشا دەستی کرد بەگێڕانەوەو ووتی: ((ژنێکم هەبوو ئەوندە یەکتریمان خۆش ئەویست تەوقێکی زێڕمان دروست کردبوو شەو کە ئەنوستین ئەمان کردە خۆمانو لەیەکتری نەئالاین هەتا خەومان لێ ئەکەوت... شەوێك لەنیوە شەودا خەبەرم بووەوە دەستم کوتا ژنەکەم دیارنەمابوو, ووتم ڕەنگە چوبێت بۆ سەر ئاوو نوستمەوە. چەند شەوێکی تریش بەهەمان شێوە نەئەما هەتا گومانم لێ پەیداکردو شەوێك بڕیارم دا بزانم چ باسە. کەخۆی لەتەوقەکە دەرهێنا منیش بەبێ دەنگ هەستامو دوای کەوتم... لەچێشتخانەکە خواردنێکی زۆری هەڵگرت, سواری ئەسپێك بوو ولەسەرخۆ لەکۆشکەکە دەرچوو و, منیش بەدوایدا... هەر ڕۆیشت...

هەر ڕۆیشت هەتا خۆی کرد بەناشەکۆنێك داو منیش لەدەرەوە لەکونێکەوەسەیرم کرد بزانم خەریکی چیە بینیم حەوت قولی زەبەلاح دانیشتون, ئەویش لەلایانەوە دانیشت, کەنانەکەیان خوارد ژنەکەم خۆی بۆ ڕووت کردنەوەو یەك یەك لەگەڵ هەر حەوتیاندا بەبەرچاوی ئەوانی ترەوە جووتبوو. کە ئیشی خۆیان تەواو کرد سواری ئەسپەکەی بووەوەو کەوتەڕێ. من بەلایەکی تردا پێش ئەو خۆم گەیاندەوە ماڵەوەو چوومەوە ناو تەوقەکە. کەژنەکەم هاتەوە خۆم واپیشاندا تازەخەبەرم بۆتەوەو پێم ووت: ئەوە لەکوێ بووی؟ وەڵامی دامەوە: لەدەرەوە بووم دەستم بەئاوگەیاند . کەوای ووت ئاگرم تێ بەربوو, هەستامە سەرپێ, شیرەکەم دەرکێشاو بۆم داهێنایەوە. پێش ئەوەی شیرەکەی لێبدەم ئەفسونێکی لێ خوێندم کردمی بەئێسترو دەری کردمە دەرەوە.

(( کابرایەك گرتمیو چەندساڵێك ڕەتاندمیەوە هەتا لاوازبووم‌و پێستم بەسەر ئێسقانم دا پووا, ئەوسا دەری کردمە کۆڵان)).

((ماوەیەك بێ کەس‌و بێ جێگامامەوە, ڕۆژێك پیاوێك بینیمی, بەزەیی پیامدا هاتەوە, جڵەوەکەی گرتم‌و دوای خۆی خستم‌و بردمیە ماڵەوە. گەیشتینە لای ژنەکەی, هاواری کرد: ئەی ڕۆ پیاوەکە خۆئەمە گوڵ پادشایە ئەو قەحبەیەی خوشکم وای لێ کردووە!))

((پیاوەکە پێی ووت : ئافرەت, ناتوانی بیکەیتەوە بەپیاوەکەی جاران؟

((ژنەکەی ووتی: بەڵێ ئەتوانم.

((ئەمەی ووت‌وئەفسونێکی خوێند بوومەوەبەپیاوەکەی جارانم. زۆر سوپاسم کردو بەژنەکەم ووت: خانمەکەم تکات لێ ئەکەم, شتێکم فێربکە باچارێکی ئەوژنە خراپ‌و خوانەناسەم بکەم)).

(( ژنەکە سێوێکی لەگیرفانی دەرهێنا, دایمێ وپێی ووتم: خۆت بگەیەنەلای و پێش ئەوەی بتبینێ ئەم سێوەی پێدابکێشە... بەلام نەکەی بهێلیی بتبینێ, ئەگینا تووشی بەلایەکی ترت ئەکات)).

_((سێوەکەم لێ وەرگرت, ئەو شەوە لەوێ مامەوەو بەیانی زوو کەوتمەڕێ, کەگەیشتمەوە کۆشکەکەی خۆم بەدزیەوە خۆم کرد بەژوورەکەماندا ژنەکەم دانیشتبوو پشتی لێم بوو, کەسێوەکەم دەرهێنا پێش ئەوەی پیایدا بکێشم ئاوڕی دایەوە, ئەفسونێکی خوێند کردمی بەتووتکە سەگێکی گەڕو فڕێی دامە کۆلان)).

((سەرت نەیەشێنم بەڕێکەوت هەمان پیاوی پێشوو بینمی و بردمیە مالەوە. کەژنەکەی چاوی پێم کەوت ووتی: ئای پیاوەکە , بەوخوایە فریانەکەوتوە سێوەکە بدات بەو قەحبەیەی خوشکم داو کردوویەتی بەم تووتکە سەگە!)).

((دووبارە چاکی کردمەوەو سێوێکی تری دامێ. ئەمجارە زۆر بەنهێنی خۆم کرد بەژوورەکەمانداو بێ ئەوەی ژنەکەم هەستم پێ بکات سێوەکەم پێداکێشاو ووتم: ببەبەتووتکەسەگێکی ڕەش... ئەوەتا هەتا ئێستاش لەو سەرتەنوورە بەستراوەتەوە)).

کەگوڵ پادشا لەگێڕانەوەی باسەکەی بووەوە بەئەحمەدی ووت:

_ ((دەی هەستە کوڕم بالەسەرت بدەم, چونکە کەس نابێ ئەم نهێنی یەم بزانێ...)).

ئەحمەد ووتی: ((قوربان فەرموو, بەلام تکایەکم هەیە, لەم ژوورەدا مەمکوژە, بابچینە دەرەوە)).

گوڵ پادشا وەلامی دایەوە: ((باشە!)).

کەچوونە حەوشەکە ئەحمەد قاڵیەکەی داخستو چووەسەری‌و بەرز بووەوە, بەپادشای ووت:

_((پادشام ماڵ ئاوا)).

پادشا لێ ی پاڕایەوەو ووتی: ((کوڕەکەم, تکایە دوورمەکەوەرەوە, ئێستا من ئەمرم خۆت بەدەستی خۆت بمنێژە... چونکە نهێنیەکەم ئاشکرابوو ئیتر بەشم لەژیاندا نەماوە)).

پادشا ئەمەی ووت‌و گیانی دەرچوو .

ئەحمەد نیشتەوە, بەدەستی خۆی شتی‌وکفنی کردو ناشتی.

سواری‌قاڵیەکەی بووەوەو ووتی : ((لەنیەتی ئەوەی بگەمە ئەو شوێنەی لە براکانم جیابوومەوە!)).

ئەوندەی بڵێی یەک‌ودوو گەیشتەوە سێ ڕێیانەکە. بینی براکانی بەکەساسی‌و بەڕەش‌و ڕووتی دانیشتوون. سڵاوی لێ کردن‌و لایانەوە دانیشت بەڵام نەیان ناسیەوە, پاش ماوەیەک پێی‌ووتن:

_((دیارە ئێوە من ناناسنەوە... من ئەحمەدی براتانم!)).

ووتیان: ((چۆن؟)).

وەڵامی دایەوە: ((نیشانە بەو ناو نیشانەی کەلەژێر ئەم بەردەدا ئەموستیلەکانمان شاردەوەو بەڵێنماندا کەلێرەدا چاوەڕێی یەکتری بکەین, وانیە؟)).

ووتیان: (بەڵێ وایە)و ئەموستیلەکانیان دەرهێنایەوەو... ئەحمەد قەفەزەکەی بەمەلەکەوەنیشانداو پێی ووتن: ((دەبانەوەستین‌وبگەینەوە لای باوکمان, بەڵکو چاوی چاک ببێتەوە)).

کەکەوتنە ڕێگا مەحمود بەدزییەوەبەمحەمەدی ووت: ((چۆن ڕوومان بێ ئێمە بەدەستی بەتاڵ بڕۆینەوەوئەحە چڵمن مەلەکە بەرێتەوە بۆ باوکم؟ خۆئیتر باوکم ئێمەی لەبەر چاو ئەکەوێو هەمووشتێک بۆ ئەحمەد ئەبێ)).

محەمەد ووتی: ((ئینجا چی بکەین؟))

((بزانین, خوا کەریمە!)).

ماوەیەکی تر ڕۆیشتن گەیشتنە بیرێك. بەئەحمەدیان ووت:

_((ئەرێ ناچیتە خوارەوە ئەختێك ئاومان بۆ بهێنی؟)).

لێ ی پرسین: ((ئەی بۆ بەم پەتە هەڵی ئەکێشین؟)).

_((ئەم بیرە لەناوەوە کارێزەو ئاوەکەی لەپەنایەکدا کۆبۆتەوە, ئەبێ بەجام بکرێتە سەتڵەکەوە ئەوسا پڕ ئەبێ)).

ئەحمەد قایل بوو, قەفەزەکەی داناو دایان کێشایە بیرەکەوە.... چەند سەتڵێکی بۆ پڕکردنو بەپەت ناردیەسەرەوە, لەخوارەوە هاواری کرد:

_((بۆم ڕاهێڵنە خوارەوەو سەرم خەنەوە)).

پەتەکەیان بۆڕاهێلاّیەخوارێ, لەناوقەدی خۆی بەستو ڕایانکێشا... کەگەیشتە ناوەڕاستی بیرەکە شیرێکیان دا لەپەتەکە پچڕاندیانو ئەحمەد کەوتە خوارەوە بۆ حەوت تەبەقەی ژێر زەمین.

براکانی بەخۆشی یەوە قەفەزەکەی مەلی هەزارەیان هەڵگرتو بەرەو شاری خۆیان کەوتنە ڕێ.

بائەمان لەڕێگا بەجێ بهێڵینو بزانین ئەحمەد چی بەسەرهات. کەکەوتە خوارەوە بۆ حەوت تەبەقەی ژێر زەمین پێش هەمووشتێك دەستی کوتا بۆ بەر باخڵی بزانێت پرچی کچەکەی پێ ماوە یان نەء. کەدەستی بەری

كەوت ئاهێكی تێ هاتەوە. ڕوانی لەپەنایەكی بیرەكەدا توولەرێیەك هەیە, هەر ڕۆیشت... هەر ڕۆیشت هەتا گەیشتە شارێك. لەقەراغ شار لەدەرگای مالێكی دا, پیریچژنێك لێ ی كردەوە, ئەحمەد پێی ووت:

_((داپیرەگیان میوان ڕائەگریت؟ )).

وەلامی دایەوە:

_((میوان بەمن ڕازی بێت بەخێربێت سەر چاوان!)).

كەنێوارە نانی بۆ دانا لەپەنجەرەكەوە چاوی لێ بووجامێكی پڕكرد لەمیزو بۆی خستە سەر سینی یەكەو بۆی هێنا. ئەحمەد پێی ووت:

_((داپیرەگیان لەم شارەی ئێوە لەباتی ئاو میز دەرخواردی خەلك ئەدەن؟)).

پیرێژنەكە تەریق بووەوە ووتی: ((داپیرە لەدەوری سەرت گەڕێ بلێم چی, ئاومان نیە)).

_((بۆچی؟)).

_((تەنها كانی یەكمان هەیە, ئەژدیهایەك بەرەكەی لێ گرتووین, ئەبێ هەفتەی جارێك كچێكی بۆ بڕازێنینەوە لەگەلّ خواردنی تردا بۆی بەرین, هەتا ئەیان خوا كەمێك لەسەر كانی یەكە ئەجولێتو ئەوسا خەلك ئاوئەبات, منیش چونكە پیرو بێ كەسم بەهەزار شەڕەشەق یەك دوو سەتلم دەست ئەكەوێ. بەیانیش نۆرەی كچی پادشایە)).

_((باشە داپیرە كەس نیە بیكوژێت؟)).

_((زۆر كەس هەولی داوە بەلام هەموو سەریان تێدا چووەو هەلی لووشیون)).

کەچوونە ناو جێگاوە ئەحمەد هەر لەدالغەی ئەژدیهاکەدابوو. بۆ سبەینێ کە گوێی لەدەنگی دەهۆڵو زورنابوو بە پیرێژنەکەی ووت:

_((داپیرە ئەوە چیە ؟)).

_((ئەوە کچی پادشا ئەبەن بۆ ئەژدیهاکە)).

ئەحمەد بەدنگی دەهۆڵو زورناکە ڕۆیشت هەتا گەیشتە خەڵکەکە . بینی کچێکی جوان ڕازاوەتەوەو پێش خۆیان داوەو یەکێکیش سینی یەکی گەورەی پڕ لەخواردنی لەسەر سەری داناوەو پێش هەموویان کەوتووە. خۆی گەیاندە پێشەوەو بەخەڵکەکەی ووت:

_(ڕاوەستن من ئەو ئەژدیهایە ئەکوژم)).

خەڵکەکە کەوتنە هاوار هاوارو بۆڵە بۆڵو ووتتیان:

_((لاچۆ باوکم, پەلەمانە وازمان لێ بهێنە)).

لێ یان پاڕایەوەو ووتی : ((ئێوە هیچ زەرەر ناکەن, باتاقی بکەمەوە, یان من ئەو ئەکوژم, یان ئەو من ئەکوژێ)).

ووتیان: (باشە).

ئەحمەد دوو شیری چەپەو ڕاست بەقنجی لەخۆی بەست, سینی یە خواردنەکەی خستە سەر سەریو چووە بەردەم ئەژدیهاکە, هەر کەچاوی پێی کەوت شالاوی بۆ هێناو لەدوورەوە هەڵی لووشی. بەڵام هەتا قوتی دا شیرەکان ووردەووردە لەتیان ئەکردو لەسەرەوە ئەحمەد بەساغو سەلامەتی دەرچوو و ئەوناوە هەمووی بوو بەخوێن.

کچەکە لەخۆشیاندا هەر ئەوەندەی پێ کرا لەپی دەستی دا لەخوێنەکەوەو کێشای بەپشتی ئەحمەداو, خەڵکەکە بەخۆشیو شادی گەڕانەوە.

ڕۆژی دوایی پادشا جاڕیدا کەکێ ئەژدیهاکەی کوشتووە بێت خەڵات ئەکرێ، هەر کەس ئەچوو کچەکەی ڕەتی ئەکردەوەو ئەی ووت: ((ئەمە نیە)).

بەپادشایان ووت: ((گەورەمان کەس نەماوە نەمان هێنابێ، تەنها میوانێکی غەریبەی ئەو قەراغ شارە ماوە، وانەچین ئەویش ئەهێنین، کەهێنایان کچەکە ناسیەوەو جێ پەنجە خوێناویەکانی پیشانی باوکی دا. پادشا ناوچەوانی ئەحمەدی ماچ کردو پێی ووت: ((کوڕم، لەپاداشی ئەم چاکەیەدا چی داوا ئەکەی ئەتدەمێ)).

_(( پادشام بەرقەرار بیت... یەك داواکاریم هەیە، بمگەیەنەرەوە سەر زەوی!))

پادشا پەستی دایگرتو ووتی:

_((بەداخەوە ئەم کارە لەدەسەڵاتی مندا نیە... لەو ناو دارستانەدا سیمرخێك ئەژی، هانای بۆ بەرە بەڵکو ئەو بتوانێ چارێکت بکات)).

ئەحمەد بەرەو دارستانەکە چوو... بینی ئەژدیهایەك خۆی لەدرەختێکی ئەستوور ئاڵاندووەو خەریکە سەر ئەکووێ... زاق و زروقی بەچکە باڵندەی ناو هێلانەکەی سەری ئەو ناوەی پڕ کردبوو، ئەیکردە نامەردی، شیرەکەی هەڵکێشا، دای لە ئەژدیهاکەو کوشتی. پارچەیەکی لێ کردەوەو هەڵی دا بۆ بەچکەکان، قۆزتیانەوەو خواردیانو هێمن بوونەوە. زۆری پێ نەچوو بەری ئاسمان تاریك بوو، بینی باڵندەیەکی زۆر گەورە هاتو لە سەر هێلانەکە نیشتەوە، ئەمە توومەز سیمرخەکەیە!.

کەسیمرخەکە بینی ئەژدیهاکە کوژراوەو بەچکەکانی ماون هاتە خوارێ بۆلای ئەحمەدو پێی ووت:

_((تۆ ئەم ئەژدیهایەت کوشتووە؟)).

وەلامی دایەوە: ((بەڵێ!)).

_((چیت ئەوێ داوای بکە ئەتدەمێ!)).

_((ئەمەوێ بمگەیە نیتەوە سەر زەوی)).

سیمر خەکە ئاهێکی هەڵکێشاو ووتی:

_((ئەمە حەوت ساڵە من بەچکەم ئەبێتو ئەو ئەژدیهایە ئەیخوات, خۆزگە حەوت ساڵی تریش هەر بەچکەم ببوایەو بخواردایە بەڵام ئەمەت لێ داوانەکردمایە. بەڵام بەڵێنم پێ داویت, ئەبێ هەوڵ بدەم.. بڕۆ حەوت مەڕم بۆ سووربکەرەوەو بەژێر باڵمەوە بیان بەستەرەوە... هەرکە داوام کرد پل پل بمدەرێ بیخۆم... ئەگەر بەشی کردم هەتا سەر زەوی وا ئەتگەیەنم, ئەگینا لەکوێدا لێم بڕا ئەتخەمە خوارێ!)).

ئەحمەد ووتی: (باشە!).

حەوت مەڕی بۆ سوورکردەوەو بەستی بەباڵیەوە,خۆشی بەستەوە بەپەڕێکی باڵیەوە, دای لەشەقەی باڵو بەرز بوەوە. هەر تەبە قەیەکیان ئەبڕی داوای گۆشتی ئەکردو ئەیدایەو, مەڕێکی ئەخوارد, ئەویش وەك تیر بەرز ئەبووەوە هەتا گەیشتنە نزیك زەوی... کەدوا پلە گۆشتی هەڵگرت بیداتێ لەدەستی کەوتە خوارەوە. ئەحمەد لەترسی ئەوەی نەك سیمرخەکە تووڕە ببێتو فڕێیداتە خوارەوە پلێك گۆشتی ڕانی بڕیو دای بەسیمرخەکە . کەخستیە دەمیەوە هەستی کرد ئەم گۆشتە تامەکەی لەوەی پێشوو جیاوازە لەبەر ئەوە لەدەمیدا هێشتیەوەو نەی خوارد . زۆری پێ نەچوو گەیشتنە سەر زەویوئەحمەدی داناو پێی ووت:

_ (( دەفەرموو بڕۆ خوات لەگەڵ , کاری من تەواو)).

ئەحمەد لەترسی ئەوەی نەك ئەگەر بڕوات سیمرخەکە هەست بکات کەئەشەڵ و گردەوەکەی ئاشکرابێت پێی ووت:

من لێرە ئەمێنمەوە , تۆ خوات لەگەڵ.

ووتی: (( نەء , هەر ئەبێ تۆ لەپێش دا بڕۆیت )).

کەئەحمەد هەنگاوی‌نا لەتاو ئازاری ڕانی بەلادا ئەکەوت .

سیمرخەکە پێی ووت: (( ئەوە بۆکەوتی؟)).

وەرامی دایەوە :

_ (( هیچ نیە, ماندووی ڕێگام!)).

_ (( ئای کەئادەمیزاد درۆزنە! ڕاستم پێ بڵێ چ باسە!)).

ئەحمەد بەدرێژی باسەکەی بۆ گێڕایەوە . سیمرخەکە ووتی:

_ (( من هەر زوو زانیم کەپلەکەی دوایی یان گۆشتی ئادەمیزادە بۆیە نەم خواردو هێشتمەوە .... ئەگەر کاتی خۆی ئەم زانی گۆشتی ئادەمیزاد ئەوەندە خۆشە یەکێکم نەئەهێشتو هەمووم ئەخوارد ... بەلام تازە لەدەست دەرچوە )).

پاش ئەمە پارچە گۆشتەکەی خستەوە سەر برینەکەی ڕانی ئەحمەدو پەرێکی خۆی پیادا هێنا یەکسەر خۆی گرتەوەو چاك بوەوە , ئەوسا دایەوە لەشەقەی باڵ و بەرەو حەوت تەبەقەی ژێر زەوی دووبارە کەوتەوە ڕێ .

ئەحمەد پاش ئەمە هەر ڕۆیشت ... هەر ڕۆیشت هەتا گەیشتەوە شارە کەی خۆیان ... کەچوە کۆشکەکەی خۆیان و براکانی چاویان پێی کەوت گاڵیان داو دەریان کردە دەرەوە .

باوکی کە ئەچاوی چاك بوو بوەوەو ئەباخی بەری گرتبوو لەدەنگە دەنگ بەخەبەر هات و دەنگی ئەحەدی ناسیەوەو

بانگی کردو پیی ووت:

_ (( کوڕم بۆچی وات لێ کردین ؟ من هەموو ئاواتێکم هەر تۆبووی کەچی تۆش بەم جۆرە بوویت)).

ئەحمەد لەمە سەری سوڕماو ووتی:

_ (( بابەگیان بۆچی؟)).

_ (( براکانت مەلی هەزارەیان پەیدا کردوتۆش چەند کاتە بێ سەرو شوێن ڕۆیشتوویتو ئێستا بەدەستی بەتاڵ هاتوویتەوە,

ئەحمەد بەسەرسامی یەوە ووتی:

_ (( بابە گیان, براکانم خراپەیان لەگەڵدا کردم , مەلی هەزارە من پەیدام کردوئەوان لێ یان دزیم پاش ئەوەی ویستیان لەناوم بەرن.)).

هـەموو بەسـەرهاتەکەی بـۆ گێڕایـەوە , بـاوکی محەمـەدو ئەحمودی بـانگ کردو پیی ووتن:

_ (( ئادەی کوڕەکانم پێم بڵێن مەلی هەزارەتان چۆن پەیدا کرد؟)).

هەرقسەیان نەکرد نەیان ئەزانی ئەڵێن چیو دەمیان تێکەڵو پێکەڵ ئەبوو , یەکێکیان ئەی ووت لەسەر هێلکە هەڵم گرتەوە , یەکێکیان ئـەیوت بـەداو گرتمو بەم جۆرە. دوایی ئەحمەد ووتی :

_ (( بابـە گیـان و براکـانم هەرچیـەکیان لەگەڵدا کـردووم گـەردنیان ئـازاد بێت ... ئەزانی بۆچی چاوت چاك نەبۆتەوە و

باخـت بەبـەر نـەهاتوە ؟... مـەلی هـەزار ئـەبێ بەسـەر قـژی کچـی پادشـای خاوەنەکەیدا بخوێنێ ئەگینا ئەفسونەکەی بەتاڵە .... ئـادەی قەفەزەکـەیم بۆ بهێنن...)).

كەقەفەزەكەیان بۆ هێنا بینی مەلی هەزارە بەحاڵ نوزەیەكی كەمی تێدا ماوەو خەریكە گیانی دەر ئەچێت.

ئەحمەد هەڵی گرتو هەموو چوونە ناو باخەكەوە, پرچەكەی لەگیرفانی دەرهێناو لەبەردەم مەلەكەدا پەخشانی كرد ... هەركە چاوی پێی كەوت دەنگو ئاوازێكی هێندە خۆشی لێ بەرز بووەوە ئەوناوەی پركرد...

یەكسەرچاوی باوكی چاك بووەوە و باخەكە گوڵی گرتو بەری هەڵ پێچا, پادشا باوەشی كرد بەئەحمەداو , ناوچەوانی ماچ كرد.

بێینەوە سەرەوكاری كچی پادشاكەئەحمەد مەلی هەزارەی لێ دزی . كەخەبەری بووەوە و برچی براوەو مەلەكەی دزراوە لەدڵی خۆیدا ووتی: (( ئەی ئافەرم بۆئەوكەسەی توانیویەتی ئم كارە بكات , بەراستی ئەمەكاری پیاوی تەواوە و

من بۆپیاوێكی واباشم....)).

ماڵ ئاوایی لەكەسو كاری كردو كەوتەرێ بەلكو ئەمەخوایە ئەوكەسە بدۆزێتەوە كەئەم كارەی پێكردوە... ئەگەیشتە هەر شوێنێك هەواڵی مەلی هەزارەی ئەپرسی ,هەتاگەیشتە شارەكەی ئەحمەدو پێیان ووت كەمەلێكی لەم حاڵو لەم رەنگەلەماڵی پادشادایە. ئاگری جگەر هەڵی گرتو خۆی گەیاندێ.

كەئەحمەد چاوی پێی كەوت خەریك بوو لەهۆش خۆی بچێتو ووتی: (( ئەمەخەوە یان خەیاڵە؟)).

_ (( بەڵێ لای منە)).

لێ ی پرسی :

_ (( خۆت پەیدات كرد یان بۆیان پەیدا كردوویت؟)).

_ (( خۆم پەیدام کردو ئەوەندەشی نەمابوو سەرم تیا بچێت)).

_ (( ئەگەرناونیشانی تەواوم بدەیتێ کەخۆت پەیدات کردوە شووت پێ ئەکەم)).

ئەحمەد سەرگوروشتەی بۆگێڕایەوەو پرچەکەی پیشان دا .

تەدارەکی شایی‌و لۆغانیان ئامادەکرد, لەئەحمەدیان مارەکردو حەوت شەوو حەوت ڕۆژ دایان لەتەقەی دەهۆڵ‌و

زوڕناو بەیەکتری شادو شوکر بوون‌و...

**منیش ها تمەوە هیچیان نەدامێ.**

# { مام مزرۆكو ترِبیجۆك }

**رۆژی ۱۹۸۰/۷/۲۱ ئاسكۆڵی حاجی محەمەدی مەڵكەندی گێڕایەوە.**

**جەلال تەقی**

هەبوو... نەبوو... كەس لەخواگەورەتر نەبوو, ژنو مێردێك هەبوو, پیاوەكە ناوی مام مزرۆكو ژنەكە ناوی ترِبیجۆك بوو, ئەم ژنو مێردە ئەمەندە دەستكورت بوون هەندێجار نانی شەویان نەبوو بیخۆن, هەر وەها لەنەقڵیشدا زۆر تەواو نەبوون. هەرچەندە بەبەختیاریو بەشارەت ئەژیان بەڵام زۆرجار لێ یان ئەبوو بەدەمە قاڵێ.

شەوێكی ساردی زستان لێ یان بوو بەشەڕ ... ئەم ووتیو ئەو وەڵامی دایەوە هەتا ترِبیجۆك رِقی هەستا, خۆی كۆكردەوەو بەمام مزرۆكی ووت: ((خوا بەزیادی نەكات بۆ خاتری پێغەمبەر , بەخوا ئەڕۆم سەری خۆم هەڵ ئەگرموبەجێت ئەهێڵمو ئیتر ناگەڕێمەوە)).

ئەمەی ووتو لێ یدا رۆیشت.

مام مزرۆك بانگی كرد:

_ (( كچێهۆترِبیجۆك وەرەوە , مەرِۆ , بەم شەوە بۆكوێ ئەچیت؟)).

وەرامی دایەوە : (( بەوخوایە مام مزرۆك نایەمەوەدو سەری خۆم هەڵ ئەگرم)).

هەرچەندە مام مزرۆك بانگی کردو دادیکردو فریادی کرد کەڵکی نەگرتو ترِ بیجۆك نەگەڕایەوە .

هەر ڕۆیشت ... هەر ڕۆیشت هەتا لەدورەوە تروسکایی ڕوناکی یەکی بەدی کردو بەرەو ڕووی ڕۆیشت ... کەگەیشتە تروسکاییەکە بینی ئاشە کۆنێکە , لەکونێکی دیوارەکەوە سیری ناوەوەیکرد بینی چوار جەردە مەنجەڵیان خستۆتە سەر ئاگرو گۆشت ئەکوڵێنن‌و ئەیخۆن. هەرچەندەیکردلەترساندا زاتی نەکرد بچێتە ژوورەوە.... چوە سەربانی ئاشەکەو دانیشت... لەسەرمان و لەترساندا زۆری پێنەچوومیزی هات کەمیزەکەی کردو بەم لاو بەولاداچۆڕاوگەی بەست دەنگی لێ هەڵبڕی‌و ووتی:

_ (( نیوەی بەم لادا بڕوات ... نیوەی بەم لادا بڕوات .. نیوەی بەولادا بڕوات ... نیوەش بەم لادا بڕوات...)).

بەم جۆرەچوارجاری ووتەوە .

هەرچەندە ترِبیجۆك مەبەستی لەم قسانە هیچ نەبوو تەنها لەبەرئەوەی بووئەترساو نەیویست بەمەترسی خۆی بڕەوێنێتەوە بەڵام جەردەکان وایان زانی هاتوونەتە سەریان‌و سەرکردەکەیان ووتی:

_ (( ئای هاوار بەماڵمان , بەخواهەر چواردەورمان گیرا.... فریا بکەون خۆتان ڕزگار بکەن !)) .

پاش ئەمە هەریەکەیان بەپەلە پرووزێ بۆی دەرچوو رایان کرد ئەوسا ترِبیجۆك هاتە خوارەوەو چوە ژوورەوە لێ ی

دانیشتو دەستی کرد بەگۆشت خواردنو لەبەرناگرەکە خۆی گەرم کردەوەو پالّی لێ دایەوە . زۆری پێنەچوو پشیلەیەك بەمیاو..میاو خۆی کرد بەئاشەکەداو بەرەو ڕوی ترپیجۆك چوو. ترپیجۆك ڕووی تێکردو ووتی:

_ ((دەبڕۆ... بڕۆ میاومیاوکەرێ ... ئەوە مام مزرۆك ناردوویەتی بەشونم دا بێمەوە ؟بەخوانایەمەوە , بەلأم قەیناکات

ئەو پلە گۆشتە بخۆ)).

پلێك گۆشتی بۆدەرهێناو بۆی هەلّدا پشیلەکە قۆزتیەوەو بۆی دەرچوو.

زۆری پێنەچوو سەگێك لەسەرماندا خۆی کرد بەئاشەکەداو بەرەو ناگرەکەچوو, ترپیجۆك ڕوی تێکردو ووتی :

_ ((دەبڕۆ بڕۆ حەپ حەپ کەرێ!... مام مزرۆك میاومیاو کەرێی نارد بەشوێنم دا نەڕۆیشتمەوە ... ئێستا تۆی ناردوە

بەدوام دا ؟ شەرت بێ نایەمەوە و بەلأم قەیناکات ها ئەم پلە گۆشتە بخۆ...)).

پلێك گۆشتی بۆدەرهێناو بۆی هەلّدا. سەگەکە قۆزتیەوەو بۆی دەرچوو.

ترپیجۆك هەردانیشتبوو و ,هەرچەند هەولّی دا خەوی لێ نەکەوت. لەنیوە شەودا بینی حوشترێك بەبارەوە هاتو

لەبەردەرگای ئاشەکەدا وەستاو کەلّ ی ورد بوەوە بینی بارەکەی پڕە لەزێڕو مرواریو سەربارەکەشی کەلّە شێرێکی زێڕە

. ڕووی تێکردو ووتی:

_ (( ئۆێ مل درێژێ !.. مام مزرۆك میاو میاوکەرێی نارد بەشوێنم دا لەگەلّی نەچوومەوە, حەپ حەپ کەرێی نارد

لەگەڵی نەچوومەوە ئێستا تۆی ناردوە؟... بەخوانارۆمەوە ... بەڵام ها , قەیناکالت ئەم پلە گۆشتە بخۆ)).

پلە گۆشتێکی گەورەی دەرهێناو بۆی هەڵدا , بەڵام خۆ حوشتر گۆشت ناخوات ؟.

ترپیجۆك هەرچەند هاواری کردو لێ ی پاڕایەوە کەگۆشتەکە بخوات حوشترەکە دەمی بۆنەبرد . لەدواییدا پێی ووت:

(( ئەوە لێم زویربویت ؟ بەو خوایە مادام ئەوەندە نەجیبیتو ئاغریت لەگەڵت دێمەوە)).

ئەمەی ووتو سواری حوشترەکە بوو بەرەو ماڵەوە ڕۆیشت ... پێش مەلابانگ دان گەیشتەوە بەردەرگاو خۆی کرد بەژووردا, بەڵام چونکە دەرگاکەیان بچووك بوو حوشترەکە پێوە نەچووو , لەبەردەرگامایەوە ... لەم کەینو بەینە مام مزرۆك خەبەری بوەوەو ووتی:

_ (( هاترپیجۆك ئەوە تۆی؟)).

وەرامی دایەوە:

_ (( خوابتگرێ بۆچی وازت لێ نەهێنام , من سەری خۆمم هەلگرتبوو بۆچی لەکۆڵم نەبووی تەوە ؟ میاو میاو کەرێت نارد بەشوێنم دا نەهاتمەوە , حەپ حەپ کەرێت ناردبەشوێنم دا ئیتر بۆچی مل درێژت نارد بەشوێنم دا؟ بەخوا دڵی ئەوم پێنەشکاو لەگەڵی هاتمەوە )).

_ (( کچێ خوابتگرێ تۆبەم شەوەتۆفە بوێ کوێ چوویت؟ ئاخرنابێ ئەقڵت بێ ؟ چۆن ئادەمیزاد بەشەوێکی وائەتۆرێو ئەڕوات؟ ئەی ئەم حوشترە چیە؟)).

_ (( ئەی تۆخۆت نەت ناردوە بەشوێنم دا؟)).

ك مام مزرۆك لەحوشترەکە ورد بویەوە بەترسەوە بەترپیجۆکی ووت:

_ (( کچێ خوابتگرێ ئەم حوشترەی پادشات بۆچی هێناوە ؟ بەو خوایە بزانن هەردووکمان هەڵ ئەواسن !)).

هەرچۆنێك بوو دەرگای حەوشەیان کێشایەوەو حوشترەکەیان بەمرخێش مرخێش هێنایە ژوورەوەو دەرگاکەیان خستەوە شوێنی خۆیو دایان خست.

پاش ئەمە هەستان بەهەرحاڵێك بوو چاڵێکیان هەڵکەندو باری حوشترەکەیان تێدا قایم کردو دایان پۆشی . ئینجامام مزرۆك ووتی:

_ (( کچێ ترپیجۆك خوابتگرێ ئەی حوشترەکە چی لێ بکەین ؟خۆناتوانین چاڵی بۆهەڵکەنینو بیشارینەوە )).

_ (( ئینجا ئەوەی بۆچی یە پیاوەکە!... سەری بڕەو بڕایەوە !)).

مام مزرۆك چەقۆی ناڵەملیو بەهەرحاڵێك بوو سەری بڕی .کەوڵی کردو ناوسکەکەی خستە پێستەکەیەوەو بردی لەو دیو ئاوایی یەوە چاڵێکی هەڵکەندو تێی خست , هاتەوە ماڵەوەو گۆشتەکەیان پارچە پارچەکردو خستیانە سەرگوێسەبانەکە بۆئەوەی وشك بێتەوە . سێچوار ڕۆژ بەفری بەسەردا باریو وشك بوەوە ,ئینجا هێنایان کردیان بەقاورمەو کردیانە گوپەوەو شاردیانەوە .

بێینەوە سەردو کاری پادشا . کەزانی حوشترەکەی نەماوە جاڕی دا هەرکەسێك حوشترەکەی دیوە خەڵات نەکرێ . ماوەکی پێچوو هیچ دەنگو باسێك نەبوو , ڕۆژێك پیرەژنێك هاتەلای پادشاو پێی ووت:

_ (( جەنابی پادشا , تازە بەتەمامەبە حوشترەکەت بەزیندویەتی دەست بکەوێتەوە چونکە هەتا ئێستا سەرنبڕاوە ...

بەڵام من بۆت ئەدۆزمەوە کێ سەری بڕیوە )).

پادشا پیٚی ووت: داپیره , بۆم بدۆزیتەوە چی بلێ ی ئەتدەمێ)).
ووتی:
پادشام بەرقەراربێ , هیچم ناوێ , تەنها سەرێك بەلەتكو سەرێك بەپەتك هەڵم كێشە بۆت ئەدۆزمەوە )).
_ (( كچێ دەسەر بەلەتكو دەسەربە پەتك هەڵت ئەكێشم )).
لەسەرئەمە رێك كەوتنو پیرێژن لێ یدا رۆیشت .هەررۆیشت ... هەر رۆیشت ... ئەم دێ بۆئەودێ ... ئەم شار بۆئەوشار هەتاگەیشتە بەردەرگای ماڵی ترپبیجۆك . لەدەرگای دا ترپبیجۆك لێ ی كردەوەو لێ ی پرسی :
_ (( داپیرگیان فرموو, چیت ئەوێ؟)).
داپیره ووتی :
_ ((بەقوربانت بم , تاقەكچێكم هەیە دوومانگە كەتوویەتی [٢] وا ئێستاتارەقی كردوەو خەریكە چاك ئەبێت و دڵی گیراوە داوای گۆشتی حوشتر ئەكات , چەند رۆژە ئەگەرێم دەستم ناكەوێت و ئەگەر هەتانە خێرت ئەگاتێ پلێكم بدەرێ بابۆی بكوڵێنمو هەمیسان نەكەوێتەوەونەمرێت)).
ترپبیجۆك ووتی: (( وەی بەسەر چاو, هەر ئێستا بۆت دێنم)).
هەستا كیتە لەیەكی بچووكی بۆ پڕكرد لەگۆشتی حوشترەكەو بەرێی كرد.
كەمام مزرۆك گەڕایەوە ترپبیجۆك باسەكەی بۆ گێڕایەوە... بەهەردوو دەست دای بەسەری خۆیدا ووتی: (( ئافرەت بۆ ئەوەندە بێ ئەقڵیت؟ نەوخوایە ئەوە رابەری پادشا بوە ناردوویەتی بۆ تاقیبی حوشترەكەی ... وا زانیان لای ئێمەیەو لەناومان ئەبەن)).

---

[٢] كەوتویی : كرانەتا.

بێ ینەوە سەرەو کاری پیریژنەکە.

بەهەڵە داوان گەڕایەوەلای پادشاو باسەکەی بۆ گێڕایەوەو ووتی: ((من بەڵێنەکەی خۆمم بەجێ هێناو ماڵەکەم بۆدۆزیتەوە، ئیتر خۆت چیان لێ ئەکەیتو چۆن تۆڵەی خۆت ئەسێنیت ئارەزووی خۆتە.... هەقی خۆمم بدەرێو ماڵ ئاوا)).

لەتو پەتکی دابە پیریژنو سواری نارد بەشەقو بەتێهەڵدان دزەکان بهێنن. کەگەیشتنە بەر ماڵەکەو لەدەرگایاندا مام مزرۆك دەرگای لێ کردنەوەو ووتی: ((فەرموون)).

کەسوارەکان بینیان بەسالاّ چوو و، بێ هێزە لێ یان ئەداو پێ یان ووت: ((هەرئێستا خۆت کۆکەرەوە پادشا بانگت ئەکات)).

مام مزرۆك ڕۆحی هاتە سەر کونەلووتیو بەلەرزەوە پیێ ووتن: (( جەنابی پادشا منی بۆ چیە؟ من نایەم!)).

وتیان: (دەم درێژی مەکە بادەمت نەشکێنین... خێرا پێشمان کەوە )).

کەبردیان ئاورێکی لەترپیجۆك دایەوەو پیێ ووت:

(( ئافرەت ئاگات لەماڵەکەبێتو ئەم دەرگاوبانە بەجێ نەهێڵیت)).

ووتی :((باشە )).

مام مزرۆکیان بردە بەردەم پادشاو پیێ ووت:

(( ئادەی بۆم باس بکە ئەوحوشترەی منت چۆن دزیو چۆن سەرت بڕیو بارەکەیت لەکوێ ساترکردوە ؟)).

مام مزرۆك دەستی کرد بەپاڕانەوەو ووتی:

_ (( جەنابی پادشا ئەوەندەم سوێندبێت من حوشتری تۆم نەدزیوە)).

پادشا ووتی: (( ئەم سەگبابە بەرن بیخەنە زیندانەوە )).

مام مزرۆکیان بردو هەرچەندە پاڕایەوە دادی نەدا!.

چەند ڕۆژێکی پێچوو مام مزرۆك هەرنەهاتەوە, تڕبیجۆك هەربۆی نەگریا بەڵام کەلکی نەبوو. ڕۆژێك زۆری

بیرئەکرد بەخۆی ووت:

_ (( بابچم سەرێکی لێ بدەم بزانم لەچیدایە , بەڵام چۆن بێگوێی بکەم‌و دەرگاکە بەجێ بهێڵم , واچاکە دەرگاکە بکێشمەوەو لەگەڵ‌خۆمدا بیبەم‌و بچم بۆلای)).

ئەمەی ووت‌و نیشت لەدەرگای حەوشە . بەهەرجۆرێك بوو دەری هێناو بەگوریس بەستیەوەو نیخە نیخ دای بەکۆڵیداو

بەرەو کۆشکی پادشا ڕۆیشت ... منداڵانی دواکەوت‌و لێ یان ئەپرسی :

_ ((تڕبیجۆك ئەوە ئۆغربێت بەم کۆڵ‌و بارەوە ؟)).

وەرامی ئەدایەوە :

_ ((لاکەون , باوکم لاکەون, ئەچم بۆلای مام مزرۆك لای پادشایە!)).

هەر ڕۆیشت  هەتا گەیشتە کۆشکی پادشاو داوای بینینی کرد یاساوڵەکان پادشایان ئاگادارکردوو پێیان ووت:

_ (( جەنابی پادشا , پیرێژنێك تەختە دەرگایەکی داوە بەکۆڵی داو ئەڵێ ئەچمەلای پادشا)).

پادشا ووتی: (( بڕۆن تەختەدەرگاکەی لەکۆڵ‌داگرن‌و بیهێنن)).

بارەکەیان لەکۆڵ کردەوەو هێنایان .پادشا لێ ی پرسی : (( پیرێژن چیت ئەوێ؟)).

وەرامی دایەوە: (( چۆن چیم ئەوێ ؟ مام مزرۆکم ئەوێتەوە , خۆ ئیشەڵڵا لێم داگیرناکەن!)).

پادشا لێ ی پرسی:

_ (( مام مزرۆك کێیە؟)).

وەرامی دایەوە :

_ ((مام مزرۆکی مێردم!)).

_ (( ئاوەرە پیرێژن , بزانم چۆن چۆن حوشترەکەتان دزیمو بارەکەتان لەکوێ شاردۆتەوە, هەرئێستا پێم ئەڵێ ی باشە پێم ناڵێ ی لەسەری مام مزرۆکی مێردت ئەدەم !)).

پیرێژن پاڕایەوەو ووتی:

_ (( پیرێژن لەدەورت گەڕێ ئێمە نەحوشترمان دزیوەو نەبارمان شاردۆتەوە )).

_ (( ئەی ئەو گۆشتە حوشترەتان لەکوێبوو؟)).

_ (( ئای جەنابی پادشاو ئەوە ئەوساڵەی کەکفتەشۆرباکە باری ئەوگۆشتەش لەگەڵ بەفرەکەدا باریو بەگوێسوانەکەی ئێمەوە گیرسایەوە, لەوساوە کردوومە بەقاورمەو هەرماومە! ئای ئەو ژنە دەڵە قۆڕە لەباتی چاکە بوختانی بۆکردمو

کردمی بەدز؟)).

پادشا تورەبوو و, تێی خوڕی:

_ (( پیرێژنە قۆڵتڕە کفتە شۆربا بارینی چی؟ پێم بڵێ بارەکەت لەکوێ قایم کردوە ؟)).

پیرێژن خۆی گێل کردو ووتی:

_ (( بەخواجەنابی پادشا لەکفتە شۆربا بەولاوە هیچی تر نەباری بوو, بارو شتی وای لەگەڵدا نەبوو... ئەوە ماڵەکەمانو بگەڕێن )).

هەرپادشا وتیو پیرێژن لەکفتەشۆربا وازی نەهێنا دوایی وەزیری دەستە ڕاست بەپادشای ووت:

_ ((پادشام ئەم ژنە دیارە شێتە , ئەگەر شێت نەبێ چۆن دەرگا لەڕیشە دەردێنێو ئەیدات بەکۆڵیدا؟ بەرەڵای بکە

بابڕوات , دیارە ئاگای لێ نیەو ئەو ئەی دزیوە !)).

(تڕبیجۆک )یان دەرکرد بەڵام نەڕۆیشتو ووتی.

_ (( بەوخوایەی یەکەو نابێ بەدوو هەتا مام مزرۆکی مێردم بەرنەدەن بەشەقیش لێرە ناجولێم )).

پادشا فەرمانی دا مام مزرۆکیان بەردا , کەهاتنە دەردوە تڕبیجۆک بردی بۆلای دەرگا شڕەکەو پێی ووت :

_ (( دەئینجا نۆرەی تۆیە هەڵی گرە!)).

مام مزرۆک واقی وڕماو ووتی :

_ ((ئافرەت ئەمە چی یە؟)).

وەرامی دایەوە :

_ (( دەرگاکەی خۆمانە , ئەی تۆ نەتوت بەجێی مەهێڵە ؟)).

_ (( کچێ خوا بتگرێ من ووتم ئاگات لەماڵەکەبێت , کەی ووتم دەرگاکە بدە بەکۆڵتداو وەرە ؟)).

_ (( بەخواقوڕت بەسەر ئەم دەرگایەم نەدایە بەکۆڵم دا پادشا بەری نەئەدایت!...)).

دەرگاکەی دابەکۆڵی مام مزرۆک داو بەگوریس شەتەکی داو ڕۆیشتنەوە .

دەرگاکەیان خستەوە شوێنی خۆیو قایمیان کردەوە شەوێ تڕبیجۆک ووتی:

_ (( مام مزرۆك, بەخوالەم وڵاتە بمێنین پادشا وازمان لێ ناهێنێتو فێڵەکەمان هەر ئاشکرا ئەبێت)).

لێ ی پرسی:

_ ((باشەو ئەی چی بکەین؟)).

وەرامی دایەوە :

_ (( باسەری خۆمان هەڵگرینو بچینە وڵاتێکی تربژین)).

_ ((باشە!)).

زیڕو مرواریەکەیان کردە دووتوورەکەوەو , دایان بەکۆڵیانداو ماڵە شڕەکەی خۆیان بەجێ هێشتو لێ یاندا ڕۆیشتن ... هەر ڕۆیشتن ... هەر ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە شارێکی دوور. لەوێ خانوویەکی باشیان کڕیو سەریان نابەیەکەوەو هەتا دوور زەمانێك بەخۆشیو کامەرانی ژیانو ...

**منیش هاتمەوە هیچیان نەدامێ.**

# (( مەلای قنگ نەشۆر))

**زۆر بەمندالی ، دایکی خوالێ خۆش بووم بۆی گێڕامەوە .**

**جەلال تەقی**

هەبوو... نەبوو.... کەس لەخوا گەورەتر نەبوو..... کەس لەبەندەی خراپ ڕووڕەشتر نەبوو... پیرێژنێك هەبوو ناوی گوڵێ بوو, مێردێکی تەمەڵی بێ کاری هەبوو بەم ڕۆژگارە لەبەر هەتاو خۆی ئەلستەوەو هیچی نەئەکرد.

ڕۆژێك پیرێژن پێی لێ کردە کەوش‌و پێی ووت:

_((ئەرێ بێ کارەی هەش بەسەرد ئەوە تۆ هەتاکەی هەروا بەدیارمەوە دائەنیشیت‌و هیچ ناکەیت؟ بەوەندە سوێندوقورئان بێ ئەچیت کارێك بکەیت ناهێڵم دوو پێت بێتەوە بەمماڵەدا )).

_((ئافرەت ژنی جاك بە, تازە من بەم ئاخری عەمرمەوە چیم پێ ئەکرێ, بۆ وازم لێ ناهێنیت, ئاخر من ئێستا چیم پێ ئەکرێ؟)).

ووتی: ((ئەبێ ببی بەمەلای نوشتەکەر!)).

_((کچێ ئافرەت ئەوە تۆ ئەڵێ ی چی! من گونی خۆم‌و گێزەر لەیەك جیا ناکەمەوە نازانم ناوی خۆم بنووسم مەلایەتیم چۆن پێ ئەکرێت؟)).

گوڵێ ووتی: ((من شتی واناچێت بەگوێمدا, هەر ئەوەتا کەپێم ووتیت, ئەبیت بەمەلای نوشتەکەر باشە, ئەگینا نایەی تەوە بەم ماڵەدا!)).

کابرا ناچار هەستا سێ چوارکتێبە شڕی زەردهەڵگەڕاوی پەیداکردو لەسەری کۆڵانێك دانیشتو کەوتە دەم جووڵاندنوتەزبیحات کردن. هەتا لای ئێوارە کەس نەهات بەلایدا, ویستی کەلوپەلەکەی کۆبکاتەوە بینی چەند منداڵێك لەماڵی پادشا هاتنە دەرەوە لەگەڵ کچی پادشادا دەستیان کرد بەیاری کردن, کچی پادشا دەنکە گەوهەرێکی زۆر بەنرخی دەرهێنا مووروموورێنیان پێکرد. زۆری پێ نەچوو لەکاتی هەڵدانەدا گەوهەرەکەی کەوتە قلێشێکی زەوی پاڵ دەرگاکەوە, هەرچەند بۆی گەڕان نەیان دۆزیەوەو کچی پادشا بەگریان گەڕایەوە لای دایکیو باسەکەی بۆ گێڕایەوە, دایکی کێشای بەسنگی خۆیداو ووتی:

ئەی هاوار بەماڵم, ئەوە خۆشەویستترین گەوهەری باوکتە, پێی بزانێ سەرمان ئەتاشێ, چاریش نیە ئەبێ پێی بڵێین.

کەئێوارە دانیشتن ژنەکە بەپادشای ووت: ((پیاوەکە چی بێ لەتۆ نهێنی , کچەکەمان خەتایەکی گەورەی کردوە!)).

پادشا پرسی: ((خێر؟)).

کەباسەکەی بۆ گێڕایەوە پادشاپێی ووت: ((گوێمەدەرێ خۆی خۆشبێ... ئەمشەو بنوون هەتا سبەینێ خوا کەریمە)).

ڕۆژی دوایی بەهەمان شێوە گوڵێ مەلای نارد بەڵکو کتێب بۆ یەکێك بگرێتەوەو شتێك پەیدابکات. لەوکاتەدا ژنی پادشا بەوێدا ڕۆیشتو مەلای بینی, ئەمەی بەهەل زانیو خۆی گەیاندێو ووتی: ((جەنابی مەلا, شتێکی بەنرخمان لێ وون بوە, ئەگەر بتوانیت بۆمان بدۆزیتەوە هەرچیت بوێ ئەتدەینێ!)).

وەڵامی دایەوە: ((ئەزانم چیتان لێ وون بووە لای ئێوارێ وەرە شوێنەكەیت پێ ئەڵێم)).

ژنی پادشا واقی ورماو پێی ووت: ((چۆن لەخۆتەوە ئەزانیت چیمان لێ وون بوە, خۆ من قسەم نەكردوە!)).

بەفیزێكەوەو لەسەر خۆ وەڵامی دایەوە: ((ئەی گوایا دوازدە عیلمو خاوەنی كەشفو كەرامات چۆن نەبێت؟... گەوهەرێكتان لێ وونبوە لەم حاڵەو لەم رەنگە!)).

ژنی پادشا ئەوندەی تر سەری سورما... چووەوە لای پادشاو باسەكەی بۆ گێرایەوە, پادشا ووتی: ((چۆن مەلای وازانا لەووڵاتدا هەیەو من نایناسم؟ نابرۆن بۆم بانگ بكەن!)).

چوون بۆ لای مەلاو پێ یان ووت كە پادشا بانگی ئەكات. بێ ئەوەی سەری لەسەر كتێبەكانی بەرز بكاتەوە وەڵامی دانەوە: ((عەرزی پادشا بكەن ئێستا ناتوانم بێمە خزمەتی چونكە خەریكی دۆزینەوەی گەوهەرەكەم, بجوولێم لێم وون ئەبێتو دەستم ناكەوێتەوە)).

كەوەڵامەكەیان بردەوە بۆ پادشا هێندەی تر سەرسام بوو و, لەگەڵ ژنەكەیدا رێك كەوتن كەلەو كاتەدا پێی ووتوە وەرەوە هەردووكیان بەیەكەوە بچن بۆلای.

لای ئێوارێ پادشاو ژنەكەی چوون بۆلای مەلا, هەر وورتە وورتی ئەهاتو ماوەیەك قسەی لەگەڵ نەكردنو وەڵامی سەلامەكەشی نەدانەوە. پاش ماوەیەك قیژاندی: ((دۆزیمەوە!))

پادشا ووتی: ((لەكوێ یەو كێ دزیویەتی زوو پێم بڵێ هەتا ریشەكێشی بكەم!)).

مەلا ووتی: ((جەنابی پادشا کەس نەیدزیوە, قلێشێك لەپاڵ دەرگای حەوشە تاندا هەیە لەوێدایە)).

چوون دەریان هێنایەوە خەڵاتێکی باشی مەلایان کردو بەخۆشی یەوە گەڕایەوە ماڵەوە. ئتر لەو ڕۆژەوە ناوبانگی بڵاوبووەوەو بەمەلای کەشفو کەرامات ناوبرا. بەڵام گوڵێ چونکە ئەیزانی بایی چەندەو هەتا بگرە نوێژیش ناکات لەماڵەوە پێی نەووت مەلای قنگ نەشۆر!.

پاش ماوەیەکی تر کچە گەورەی پادشا لەگەڵ کچی وەزیردا خۆیان ڕازاندەوە کەبچن بۆ گەشتو گوزار, کچی وەزیر حەزی لەپارچە گەوهەرێکی زۆر بەنرخی کچی پادشا کردو بەدزیەوە خستیە گیرفانیەوە. بۆ ڕۆژی دوایی کەکچی پادشا سەیری سندوقی گەوهەرەکانی کرد پێی زانی, بەنرخترین پارچەگەوهەری نەماوەو هانای هێنا بۆ دایکی. بەڕێکەوت کچی وەزیریش لەوێ دانیشتبوو, ژنی پادشا ڕووی کردە کچی وەزیرو پێی ووت: ((ئادەی بەقوربانت بم, من میوانم هەیە تۆ بچۆرە لای مەلاو باسەکەی بۆ بگێڕەوەو, بەزمان منەوە پێی بڵێ بۆمان بدۆزێتەوە)). کچی وەزیر چوو بۆلای مەلاو ڕاسپاردەکەی ژنی پادشای پێ ووت. زۆریش ترسی لێ نیشتبوو نەك مەلا بزانێ ئەو دزیویەتی, لەبەر ئەوە پێی ووت: (( باشە مەلا, تۆ چۆن ئەزانی کێ بردوویەتی؟)).

مەلا لەم قسەیەی گومانی پەیدا کردو پێی ووت:

_((کچم کتێبەکانم هەموو شتێکیان تێدانووسراوە, هەر لەگەڵ کردمنەوە یەکسەر ئەزانم کێ دزیویەتی!))

کچی وەزیر لەرزی لێ هات, خۆیدا بەسەر دەستو پێی مەلاداو پێی ووت:
(( مامۆستا دەستم دامێنت... من کردم تۆنەکەیتو ئابڕووم مەبە, من دزیومە!)).

_((کچم ئەزانم... بڕۆبهێنە, بەژنی پادشاش بڵێ بەیانی خۆم بۆیان ئەهێنمەوە)).

کچی وەزیر وەڵامەکەی بردەوە بۆ ژنی پادشاو گەوهەرەکەی هێنایەوە بۆمەلای قنگ نەشۆر. مەلا بۆ سبەینێ بردیەوە بۆژنی پادشا, ئەویش خەڵاتێکی باشی کردو گەڕایەوە ماڵێو بەژنەکەی ووت:

_((گوڵێ, وا ئەم جارەش ڕزگارمان بوو, بەڵام بەو خوایە سەرم ئەدەیت بەفەتارەتێکداو ئەم فێڵو فەرەجەمان هەر ئاشکرا ئەبێت!)).

گوڵێ بەپێکەنینەوە وەڵامی دایەوە: ((گوێ مەدەرێ خوا کەریمە!)).

ناوبانگی غەیب زانیو کەشفو کەراماتی مەلا قنگ نەشۆر هەتا ئەهات زیاتر بڵاو ئەبووەوە دنیای گرتەوە. ڕۆژێك غەزنەی پادشایان بڕیو باری چل ئێستر زێڕوزیو و گەوهەروکەلو پەلی بەنرخیان دزی. پادشا ناردی بەشوێن مەلاداو پێی ووت:

_((مامۆستا, تاکە هیوام تۆیت ئەم سامانەم بۆبدۆزیتەوە, مەرج بێت هەتاچل ڕۆژی تر بۆم نەدۆزیتەوە لەسەرت ئەدەم, بیدۆزیتەوە چیت ئەوێ ئەتدەمێ!)).

مەلا بەپەستیو بەدڵێکی پڕ لەپەژارەوە هاتەوە ماڵەوەو باسەکەی بۆ ژنەکەی گێڕایەوە.

ئەو جەردانەی غەزنەی پادشایان بڕیبوو چل کەس بوون. شەوێ سەرۆك دزەکان یەکێك لەدزەکانی نارد کەبچێت بزانێ لەماڵی مەلا چ باسە, چونکە

زانیبوویان پادشا هانای بردۆتە بەر مەلا. ناوبانگی مەلاش ئەوندە بڵاوبوو بووەوە ترسیان لێ نیشتبوو.

شەوێ مەلا لەگەڵ ژنەکەیدا دانیشتبوو, بیری لەوە ئەکردەوە کەچۆن لەم بەڵایە ڕزگاری بێت, هەر چەند سەری ئەهێناو سەری ئەبرد تروسکایی بەدی نەئەکرد. بەچرپە لەبەر خۆیەوە ئەیوت: ((ئاخ گوڵێ....

داخ گوڵێ....

ئەویان خۆم چاوم لێ بوو,

ئەویان خۆی هات پێی ووتم,

ئەمە کێ پێم بڵێ....))

ئەو چل مریشکەمان هەیە واچاکە هەر شەوێ یەکێکی بخۆین هەتا پادشا لەملم ئەدات!)).

گوڵێ بەرامبەری دانیشتبوو گوێی لەوورتە وورتی مەلا بوو بەڵام نەی ئەزانی ئەڵێ چیو لێ ی پرسی:

_((ئەرێ ئەو بوڵە بوڵەت لەچیە؟))

مەلا قیژاندیو بەنەڕەوە پێی ووت:

((کچێ قوزەڵقۆرتە بەچاڵی چاوت, ئەڵێم ئەمە یەك لەچلان!))

دزدکە کە لەسەربان خۆی گرتبوو و, ملی بەکلاو ڕۆژنەکەدا شۆڕکردبووەوەو گوێی لەم قسەیەی دوایی بوو لەترساندا ناوکی کەوتو بەهەڵەداوان خۆی گەیاندە لای هاوڕێکانیو بەسەردزەکەی ووت: ((قوڕمان بەسەر تیاچوون, مەلا پێی زانیوین؟))

سەر دزان ووتی: ((چۆن؟)).

وەڵامی دایەوە: ((هەر کەگەیشتمە سەربانەکەیان و سەرم بەکلاو ڕۆژنەکەدا شۆڕکردەوە گوێم لێبوو بەژنەکەی ئەووت: ئەمە یەك لەچلان. دیارە زانیویەتی ئێمەین, ئەگینا چۆنی زانی کەچل کەسین و یەکێکیشمان لەوێ یە؟)).

لەڕاستی دا مەلا کەوتی ئەمەیەك لەچلان مەبەستی لەوەبوو کەئەمە شەوێك لەچل شەوی مۆڵەتەکە تێپەڕی و بامریشکێك لەچل مریشکەکان بخۆین.بۆ شەوی دووهەم سەردزەکە یەکێکی تریشی لەگەڵ ئەوەی دوێنێ شەودا نارد کەخۆیان بگرن بزانن مەلا ئەمشەو چی ئەڵێ. مەلا بەهەمان شێوەی شەوی ڕابردوو بەرامبەر مەلاژن دانیشتبوو بەچرپە لەگەڵ خۆیدا قسەی ئەکردو ئەیووت:

_((ئاخ گوڵێ....

داخ گوڵێ.....

ئەویان خۆم چاوم لێ بوو,

ئەویان خۆی هات پێی ووتم, ئەمیان کێ پێم بڵێ!)).

پاش ئەمە دەنگی لێ هەڵبڕی و ووتی:

_((ئادەی بێنە ئەمە دوولەچلان!)).

هەردوو دزەکە بەپەلە پڕووزێ خۆیان گەیاندەوە لای هاوڕێکانیان وباسەکەیان بۆ گێڕایەوە. سەردزەکان لێ یان تووڕەبوو و, پێی ووتن: (( دیارە ئێوە لەترساندا گوێتان زرنگاوەتەوە, سبەی شەو خۆمتان لەگەڵدادێم)).

سبەی شەو سەردزەو دوانەکەی پێشوو چوونە سەربانی ماڵی مەلا, ئەویش وەك دووشەوەکەی پێشوولەبەر خۆیەوە ئەیووت:

_((ئاخ گوڵێ....

داخ گوڵێ....

ئەویان خۆم چاوم لێ بوو, ئەودیان خۆی هات پێی ووتم,

ئەمەیان کێ پێم بڵێ...))

دوایش بەدنگی بەرز قیژاندی:

_((کچێ گوڵێ, ئەمشەو نۆردی گەورەکەیانەو ئەمەسێ لەچلان!)).

ئەو مەبەستی لەوە بوو کە بانەمشەو مریشکە گەورەکە سەرببڕن, بەڵام سەردزەکە وای زانی کەمەلا پێی زانیوە ئەو خۆی هاتووە کە گەورەی دزەکانە. لەکلاّو ڕۆژنەکەوە هاواریان کرد: ((مامۆستا ئێمە کردمان تۆ نەیکەیو سەرمان بەفەتارەتێك نەدیت, ئێمەدزیومانە!)).

مەلا حەپەسا, بەڵام وەڵامی دایەوە:

_((هەر زوو زانیم ئێوەن. بەڵام لەبەر ئەودی خۆتان هاتوون قسەناکەم... هەر ئێستا بڕۆن هەر چل بارەکە بێ زیادو کەم بهێننەوەو لەو حەوشەیەدا دایانبنێن.... لێشتان خۆش ئەبمو ڕاسیتان لێ نالێم)).

چووەنەوە لای هاوڕێکانیانو سەر دزەکە پێی ووتن:

_((مردووتان بمرێ هەتا زووە بارو بارخانەکان بەرینە ماڵی مەلا هەتا ڕاستی لێ نەوتووینو لەناونەچووین, ئەو ماڵ وێرانە هەموو شتێك ئەزانێتو ئاگاداری هەموو کارێکە)).

باسەکەی بۆگێڕانەوەو هەر یەکەیان بەنقەنق بارێکی دا بەکۆڵی داو هەر چل بارەکەیان لەحەوشەی ماڵی مەلادا لەسەر یەکتری کەڵەکەیان کردو یەك یەك دەستی مەلایان ماچ کرد کەلێ یان خۆش بێتو ناویان نەهێنێو ڕۆیشتن.

بەیانی کەهەتاو کەوت مەلا گوڵێی نارده لای پادشاو ڕای سپارد پێی بڵێ:

_((جەنابی پادشا, مەلا ئەفەرموویێت کاروان بنێرن بارو بارخانەکەتان بەرنەوه ڕێگامان نیه پیایدا بڕۆین)).

پادشا سەری سوڕماو باوەڕی نەکردو ووتی:

_((من چل شەوم مۆڵەت دا بوویه چۆن بەسێ شەو بۆی دۆزیمەوه؟))

خۆی هەستا لەگەڵ گوڵێ بۆ درۆو ڕاستی هات بۆ ماڵی مەلا... بینی ڕاستەو شتەکانی هەموو هاتوونەتەوه. ویستی بچێت بۆلای مەلا کەسوپاسی بکاتو هەر لەوێ خەڵاتی بکات گوڵێ پێی ووت:

_((جەنابی پادشا مەلا خەریکی زیکرو تەهلیلەیە وەڵامی کەس ناداتەوه, دوایی خۆی دێتە خزمەتت!)).

شتەکانیان بارکردو بردیانەوه ماڵی پادشا. ناوبانگی مەلا ئەوەندەی تر پەرەی سەندو لەهەموو لایەکەوه ئەهاتن بۆلایو خێرو بێرێکی زۆری بەسەردا باری.

پاش ماوەیەك مەلای مزگەوتی پادشا نەخۆش کەوت, پادشا ناردی بەدوای مەلای قنگ نەشۆردا کەبێت پێش نوێژیان بۆ بکات, مەلا ڕووی کرده گوڵێی ژنیو پێی ووت:

_((ئافرەت خوا بتگرێ, ئەمە ئەو ڕۆژمیە کەمن لێ ی ئەترسام!... ئاخر منو پێش نوێژیی کوجا مەرحەبا, بۆچی من شایەتوومان ئەزانم هەتا پێش نوێژیی بکەم؟)).

چاری نەبوو و, تازه کار لەکارترازرابوو, خۆنابێ بەپادشا بڵێ نەخوێندەوارەو نوێژ نازانێ؟! چوو بۆ مزگەوت لەپێش خەڵکەکەوه بەپێوه وەستا... ماوەیەك بێ دەنگ بەو جۆره مایەوەو نوێژی دابەست... لەپڕ

وەك تیر بیٚو لەکەوان دەربچێت تیٚی تەقاندو ڕایکردە دەرەوەو پادشاو وەزیرو خەڵکەکەی تر بەدوایی دا بیٚ ئەوەی بزانن بۆچی ڕایان کرد. هێشتا لەحەوشەی مزگەوت دوور نەکەوتبوونەوە ژووری نوێژ کردنەکە زرمەی لیٚ هەستاو ڕوخا. پادشا مەلای گرتەوەو پیٚی ووت:

_((ماشاڵلا لە مەلایەتیت!... ئەوە چۆنت زانی ئەو مزگەوتە ئەڕوخێت؟)).

مەلا وەڵامی دایەوە.

_(( قوربان دەنگێك لەغەیبەوە پیٚی ووتم ... شتێکی تریشی پیٚ وتم, ئەویش ئەوە بوو کەئیتر بڕای بڕ نابیٚ نەکتێب بۆکەس بگرمەوە, نەنهێنی هیچ دزی یەك ئاشکرابکەم. نەپێش نوێژیی بکەم ... بەکورتی گەورەم ئەبیٚ ئیتر لەمەو دوا لەماڵی خۆم دانیشم هیچ غەیبو کەراماتێك نەنوێنم, لەبەر ئەوەی ئەبیٚ جەنابیشتان وازم لیٚ بهێنن‌و ئەگەر شتێکت لیٚ قەوما هانا بەرنە بەر مەلایەکی تر!)).پادشا دەستی دا بەیەکداو ئاخێکی هەڵکێشاو ووتی:

_(( بەڕاستی ئەمە جێگەی داخە... من ئەگەر تۆ هاوکارم بویتایە هەرگیز دوژمن زەفەری پیٚ نەئەبردم, بەڵام بڵێم چی, فەرمانی خوایە, دیارە کۆتاییمە بۆیە ئیتر تۆ نابیٚ هاوکاریم بکەیت!)).

بەم جۆرە مەلا بەم فێڵە خۆی ڕزگارکرد نەك بەزمەکەی ئاشکرابیێت‌و تووشی ناڕەحەتی ببێت... مەلاژن هەرچەند هەڕەشەی لیٚ کرد کە هەر مەلایەتی بکات گویٚی لیٚ نەگرت‌و ووتی:

_((کچیٚ ئافرەت ئەقڵت بیٚ, باهەتا سەرمانی تێدانەچوە وازبهێنین‌و بەم سامانەی پەیدامان کردوە ڕازی بین‌و بەئاسودەی بژین)).

مەلاو مەلاژن تەمەنێکی دوورو درێژ ژیان‌و ئاخریەکەی هەر چوونە ژێر گڵ.... دوعایان بۆ بکەن نەهلی ئیمان بن... منیش هاتمەوە هیچیان نەدامێ.

# {تەلی هەزار}

**خوێندەواری بەڕێز:..**

**ئەم چیرۆکە نمونەیەکی چیرۆکی ئەفسانەیی کوردەکانی یەکێتی سۆڤیەتە. (عەلی جەنگۆ) کەلە ساڵی ١٩٧٢دا لەدێی جارجاریسی ئەرمەنستانی سۆڤیەتی تورکیا بوون,گێڕاویەتی یەوەو م. ب. ڕۆدینکۆ, کەزانایەکی کوردناسی سۆڤیەتە وەری گێڕاوەتە سەر ڕوسی‌ولە ساڵی ١٩٨٠دا لەمۆسکۆ لەگەڵ کۆمەڵەچیرۆکێکی فۆلکلۆریی‌و ئەفسانەیی کوردیدا بەناوی( چیرۆکی ئەفسانەی میللی کوردی ) یەوە چاپی کردوە. منیش لەڕوسی یەوە کردمەوە بەکوردی . شێوەی ئەم چیرۆکە, بەکەمێك جیاوازی یەوە لای خۆشمان هەیە, بەلام ئەمەیانم هەڵبژارد بۆ زانینی نمونەی چیرۆکی ئەفسانەیی کوردی دەرەوەی کوردستانی عیراق .**

**جەلال تەقی**

پادشایەك هەبوو سێ کوڕی هەبوو . گەورە بوون‌و کاتی ئەوەیان هات ژن بهێنن. ڕۆژێك وەزیر بەپادشای ووت:

_((پادشام پایەداربێت... کوڕەکانت گەورەبوون‌و کاتی ژن هێنانیان هاتووە, نیازی چیت هەیە؟)).

_((ڕاست ئەکەیت, بالەگەڵ ژنەکەمدا قسەبکەم بزانم ئەڵێ چی!)).
پادشا چوو بۆلای ژنەکەی و پێی ووت:
_((وەزیر ئەڵێ ژن بۆ کوڕەکانمان بهێنین... بەڵام ئێمە هێشتا تاقیمان نەکردوونەتەوەو نازانین چۆنن)).
_((پادشام , با یەکی کیسەیەك زێڕیان بدەینێ چۆنیان بوێ با بەئارەزووی خۆیان خەرجی بکەن, بزانین چیان لەتوانادایەو چی لێ ئەکەن!)).
_((تەکبیرێکی چاکە!))
پادشا هەرسێ کوڕەکەی بانگ کرد, یەکی کیسەیەك زێڕی دانێ و پێی ووتن:
_((ئەم زێڕانە چۆنتان ئەوێ وا خەرجی بکەن!)).

کوڕە گەورەکەی پارچە زەوی یەکی لەباوکی سەند, کۆشکێکی گەورەی تێدا دروست کرد, هەموو پێویستی یەکی کڕی و کچی وەزیری مارەکردو بەکامەرانی ژیا.
کوڕی ناوەنجیش چاوی لەبرا گەورەکەی کرد, کۆشکێکی دروست کرد, کچی سەرکاری پادشای مارەکردو بەکامەرانی ژیا.
بائەوان لەوێ بژین, بزانین کوڕی بچووك کەناوی (سێفدین)بوو چی ئەکات.
لەجێگایەك دابین نەبوو, دەستی کرد بەگەشت و گوزار بەو دنیایەدا هەتا گەیشتە وڵاتێکی دراوسێ. بینی لەووڵاتە مەڕومالات زۆر هەر زانە. ڕانە مەڕێکی لاوازی کڕی و بەخۆی ووت: (( هەتا نەگەمەوە ماڵێ ئەم مەڕە

لاوازانــە ئەوەنــدە بــەڕێگاوە ئەلــەوەڕێن قەڵــەو ئــەبن و لــە وڵاتــی خۆمــان بەنرخێکی باش ئەیانفرۆشمەوە)).

لەڕێگا گەیشتە نزیك ئەشکەوتێك, بینــی دێــوێکی گەورەی ترسـناکی یـەك چاو دانیشتووە. لـە دڵـی خـۆیدا ووتـی: (( چۆن بـە زینـدویـەتی لـەم دێـوە ڕزگارم بێت؟)).

چووە بەردەمی دێوەکەو پێی ووت:

_((سەلامون عەلەیکوم باپیرە!)).

_(( وە عەلەیکومە سەلام کوڕم ...تۆ لەکوێ من ئەناسیت؟)).

_(( باپیرە چۆن ناتناسم؟ بـاوکم هەموو جارێك باسـت ئـەکات و ئـەم ڕانـە مەڕەشی بەدیاری بۆ ناردویت... دیارە لەبیرت چووە کەتۆو باوکم وەك بـرا وابوون)).

چـوونە ئەشــکەوتەکەوە, ســێڤدین ئــاگرێکی کــردەوەو چــەند مــەڕێکی سەربڕی و برژاندنی و دانی بەدێوەکە خواردنی.

دێوەکە ووتـی: ((بـەخوا شـتێکی خۆشـە !... باوکـت دیـاری یـەکی باشـی بـۆ ناردووم)).

شەو لەئەشکەوتەکەدا ڕۆژیان کردەوەو بەیانی سڤێدین بەدێوەکەی ووت:

_(( باپیرە دەئیتر ڕێگام بدە بابڕۆم)).

_(( چیت خەڵات بکەم؟))

_(( هەر ساخ و سەلامەتی تۆم ئەوێ و هیچی تر)).

_(( نابێ ... نابێ... ها ئەم کیتەڵە یەت ئەدەمێ لە ڕێگا ئاوی تێکە))

کیتەڵەیەکی مسی بچکۆلەی دابە سێڤدین , ئـەویش سوپاسـی کـردو لێ یـدا ڕۆیشت و, بەخۆی ووت: (( باشە من چی بە باوکم بڵێم؟)).

هەر ڕۆیشت.. هەر ڕۆیشت هەتا گەیشتە کۆشکی گەورە باخو باخاتێکی فراوان دەوریدا بوو و, تافگەیەکی ڕەنگین هاژەی ئەهات. بیری کردەوە:

_(( خۆمن زۆرماندووم.. باکەمێك بحەسێمەوە, ئەو سا ئەڕۆم)).

چوە نزیك تافگەکە, دەمو چاوی شتو کیتەڵەکەی دەرهێنا کەپڕی بکات لەناو . بینی تۆز لە ملەکەی نیشتوە, کەفوویەکی لێ کرد بۆ ئەوەی تۆزەکەی لێ بێتەوە لەشکرێکی گەورە لەبەر دەمیدا پەیدا بوو و, سەرۆکەکەیان لێ ی هاتە پێشەوەو پێی ووت:

_((گەورەم فەرمانت بەچیە , جیهان تێك بدەین؟))

سێڤدین پێی ووت:

_(( جیهان وەستاوەو ئێمەی لەسەرین ئیتر بۆچی تێکی بدەین؟ من هەر نەختێك بیرم کردنو ویستم پتانبینم, ئێستا ئەتوانیت لەشکرەکەت بەریتەوە!)).

کەئەمەی ووت لەشکرەکە وون بوو.

ئەم کۆشکە هی تەلی هەزاری نازدارو جوان بوو. کەلەپەنجەرەکەدا وەستابوو, ئەمەی بینی بەکارەکەرەکەی ووت:

_ (( برۆ بەو کوڕە بڵێ تەلی هەزار بانگت ئەکات )).

سێڤدین هاتەکۆشکەکەو بردیانە ژوورێکی گەورەوە کەلەهەموولایەکەوە پەردەگێڕدرابوو, تەلی هەزار لەپشت پەردەوە پێی ووت:

_ (( ئەرێ کوڕەکە تۆکێیتو لەکوێوە دێیتو بکوێ ئەچیت؟)).

سێڤدین ووتی:

_ (( ئەی تۆ لەکوێیت, بۆچی ناتبینمو هەرگوێم لەدەنگتە؟)).

دەنگەکە وەرامی دایەوە :

_ (( من لەم دیو پەردەم... بۆئەوەی تەنها یەك پەنجەم ببینن هەزار زێڕم ئەدەنێ , تۆچۆن ئەتوانی بم بینیت؟)).

_ (( من سێڤدین کوڕی پادشای دراوسێتانم )).

_ (( ئەو کیتەڵەیەم بدەرێ چیت ئەوێ ئەتدەمی )).

_ (( هەتا بەرپشتێنەکەت خۆت ڕوت بکەردوەو خۆتم پیشان بدە ئەتدەمێ))!.

_ (( شتێکی باشە , تەنها بۆبینینی پەنجەیەکم هەزار زێڕم ئەدەنێ وتۆش داوای چی ئەکەیت !)).

_ (( ناتەوێ... نەتەوێ ... خۆمن داوام لێ نەکردویت, تۆداوام لێ ئەکەیت ... ناتەوێ ئەڕۆم بەرێگای خۆمدا)).

سێڤدین کیتەڵەکەی هەلگرتو ویستی بڕوات.

( تەلی هەزار) لەگەڵ کارەکەرەکەیدا ڕاوێژی کردو ووتی:

(( چی تێدایە ئەگەر جارێك بەو جۆرە سەیرم بکات... بەمە ئەتوانم ئەگەر بمەوێ هەموو جیهان تێك بدەم )).

سێڤدینیان بانگ کردەوە و تەلی هەزار هەتا پشتێنەکەی خۆی ڕوت کردەوەو خۆی پیشانی سێڤدین دا .. ماوەیەك تەماشای کرد , کیتەڵەکەی دایەو بەرەو ماڵەوە کەوتە ڕێ .

پادشایان ئاگادارکرد کەکوڕەکەی هاتۆتەوە , بانگی کردەلای خۆی و لێ ی پرسی:

_ (( ئاددی کوڕم بزانم پارەکەت داوە بەچی ؟ براکانت کۆشکیان بۆخۆیان دروست کردو ژنیان هێنا. ئەی تۆ چیت کردوە؟)).

_ (( باوکەگیان ئەوان یەکی کۆشکێکیان دروست کردوە , بەڵام من سەدەها کۆشکم دروست کردوە )).

_ ((کامەتان کوڕەکەم , چۆنت دروست گردوون ؟)).

_ (( هەرلێردوە هەتا حەلەب چی خانونەرەو کۆشكو تەلار هەیە هی منە چونکە پارەکانم بۆهاوڕێو برادەرا خەرج کردوە)).

پادشا ووتی: (( من ئەم کارەم بەدڵ نیە)).

سێڤدین چووبۆلای دایکیو لیٚ ی پاڕایەوەو ووتی:

_ (( دایەگیان , بەباوکم بڵێ باکیسەیەکی تر زێڕم بداتێ )).

کەدایکی بەپادشای ووتو پادشا وەرامی دایەوە :

_ (( لەبەر ئەوەی کوڕێکی بێکارەیە نامەوێ هیچی تری بدەمێ)).

دایکی بەپادشای ووت: (( خواراوەستاوت کات ,تۆ پادشایتو کیسەیەك زێڕ بۆتۆ هیچ نی یە , کیسەیەکی تری بدەرێ بزانین ئەم جارە چی ئەکات , سێڤدین لەبراکانی زیرەك ترە)).

پادشا قایل بوو و, کیسەیەکی تری زێڕی دایە .

سێڤدین دووبارە چوو بۆ وولاتەکەی پێشوو , لەوێ کۆمەڵە گوێرەکەیەکی بەهەرزان کڕیو هێنایەوە بۆلای دێوە یەك چاوەکە . دێوەکە پێی ووت:

_ (( بەخێرهاتی کوڕەکەم ... ئەمجارە چیت بۆهێناوم ؟)).

_ (( ئێستا ئەبینیتو بەدڵت ئەبێت )).

سێڤدین ئاگری کردەوەو گوێرەکەیەکی تەواوی بۆبرژاندو خواردی.دێوەکە پێی ووت:

_ (( ئای کەبەلەزەتە... خۆزگە زوو زوو دیاری وات بۆ بهێنامایە !)).

سێڤدین شەو لەوێمایەوەو بەیانی خۆی کۆکردەوە بڕوات . دێودکە پێی ووت:

_ (( چیت خەڵات بکەم ؟ ))

___ (( هەرساغو سەلامەتی تۆم ئەوێ هیچی تر! )).

دێوەکە سفرەیەك و گۆچانێکی دایەو پێی ووت:

_ (( هاکوڕم ئەمانە بگرە ... هەرکاتێ برسیت بوو سفرەکە داخەو گۆچانێکی پێدا بکێشە, هەرخواردنێك بخوازیت بۆت ئامادە ئەبێت )).

ماڵئاوایی لێ کردوو کەوتەڕێ . هەر ڕۆیشت ... هەر ڕۆیشت هەتا گەیشتە کۆشکەکە ی تەلی هەزار . چوەباخەکەوەو لەتاڤگەکە دەمو چاوی شتو سفرەکەی داخستو گۆچانێکی پیادا کێشا . سفرەکە پڕبوو لەخواردنو خواردنەوە . تێری خواردوو سفرەکەی پێچایەوە . تەلی هەزار لەپەنجەرەکەوە ئەمەی بینی و, کارەکەرەکەی نارد بەشوێنیدا . کەهاتە ژوورەوە زۆر بەدڵ نەواییەوە قسەی لەگەڵدا کردو ووتی:

_ (( سێڤدین ... چیت ئەوێ ئەتدەمێ ئەو سفرەیەم بدەری )).

سێڤدین پێی ووت:

_ (( خانم, تۆخۆت ئەزانیت من پارەو سامانم ناوێ .. خۆت ڕووت بکەرەوە باتەواو سەیرت بکەم سفرەکەمو گۆچانەکەمت ئەتدەمێ )).

_ (( چۆن خۆمت بۆڕوت بکەمەوە؟... تەنها بۆبینینی پەنجەیەکم هەزار زێڕم ئەدەمێو , تۆش داوای چی ئەکەیت ! )).

سێڤدین پێی ووت:

_ (( ناتەوێ... نەتەوێ... وامن ڕۆیشتم ! )).

ئەمەی ووتو هەستا بڕوات تەلی هەزار بیری کردەوە : (( بائەم شێتۆکەیە جارێك بەڕووتی سەیرم بکاتو بڕوات , خۆکەس پێی نازانێت , خۆشی وادیارە ئەوەندە گێلو شێتە هیچ نازانێت )).

تەلی هەزار سەرتاپا خۆی ڕووتو قووت کردەوە , سێڤدین ماوەیەك تەماشای کرد, سفرەو گۆچانەکەی بۆداناو لێ یدا ڕۆیشت:

هەر ڕۆیشت .. هەر ڕۆیشت هەتاگەیشتەماڵەوە بەبێدەنگی خۆی کرد بەلای دایکی دا چوونکە ئەیزانی باوکی ببینێ لێ ی تووڕە ئەبێ لەدایکی پاڕایەوەو پێی ووت:

_ (( یارمەتیم بدە دایە گیان .... هەمیسان پارەکەم بەفیڕۆدا , بەباوکم بڵێ باکیسەیەکی ترم بداتێ )).

دایکی ترساو ووتی:

_ (( ئەوە تۆ ئەڵێ ی چی کوڕم؟... باوکت بزانێ تۆش ئەکوژێتو منیش سەرئەبڕێ ؟!)).

ئەوەندە پاڕایەوە دایکی ناچار چوو بۆلای وەزیرو سەرکاری پادشاو باسەکەی تێگەیاندن .. ئەوسا هەرسێکیان چوون بۆلای پادشاو داواکاریەکەی سێڤدینیان پێ ووت:

پادشا تووڕەبوو قیڕاندی : (( هەر ئێستا لەملی ئەدەم !)).

وەزیرو سەرکار بەسەریداهاتنو خاویان کردەوەو , لەدواییدا ووتی:

_ (( ئەمجارەش کیسەیەکی تری ئەدەمێ , بەڵام بەومەرجەی ئیتر چاوم بەچاوی نەکەوێتەوە !)).

کیسەیەکی تری زێڕیدایەو لێ یدا ڕۆیشت . هەر ڕۆیشت ... ڕۆیشت هەتا گەیشتەوە هەمان شار . ئەم جارە گاگەلێکی هەرزانی لەڕوولاوازی کڕیو

کەوتە ڕێ . هەتا گەیشتە ئەشکەوتی دێوە یەك چاوەکە بەباشی لەوەڕان و قەڵەوبوون.

کەدێوەکە چاوی پێی کەوت بەدڵخۆشی یەوە چووبەپیریەوەو پێی ووت:

_ (( بەخێربێیت کوڕە خۆشەویستەکەم .... ئەمجارە چیت بۆ هێناوم ؟)).

_ (( باپیرە , ئەمانەش وەك ئەوانەی پێشوو وان بەڵام لەوان گەورەترو بەتام ترن !)).

سێڤدین ئاگرێکی کردەوە و گایەکی سەر بڕیو بۆی برژاندو دەرخواردیدا . دێوەکە پێی خۆش بوو و ووتی:

_ (( ئەمەیان زۆر بەلەزەتە. .. هەرهی وام بۆ بهێنە )).

سێڤدین شەو لەوێمایەوەو بەیانی خۆی کۆکردەوە بڕوات ... دێوەکە جامێکی دایەو پێی ووت:

_ (( هاکورم ئەم جامە بگرە ... ئەگەر لەڕێگا تینووت بوو ئاوی پێ بخۆرەوە )).

جامەکەی وەرگرتو لێ یدا ڕۆیشت . هەر ڕۆیشت ... ڕۆیشت هەتا گەیشتە کۆشکەکەی تەلی هەزار . لەتاڤگەکە جامەکەی پڕکرد لەئاوو خواردیەوە. بینی جامێکی ئاساییەو هیچ گرنگیەکی نیە , ووتی:

_ (( نای ئەم جارە دێوەکە خەڵەتاندمی!)).

ئەمەی ووتو جامەکەی ڕاوەشاندو ویستی توڕی هەڵدا ... بینی ئەو ئاوەی لەبنەکەیدا مابووەوە بوبوزێڕ تەلی هەزار لەپەنجەرەکەوە ئەمەی بینی بەپەلە کارەکەرەکەی نارد بەشوێنیداو پێی ووت: (( سێڤدین ... تەلی هەزار ئەڵێ بفرموێ بۆلام )).

کەچووبۆلای پێی ووت:

_ (( سێڤدین ... چیت ئەوێ ئەتدەمێ ئەوجامەم بدەرێ )).

وەلامی دایەوە

_ (( جامەکەم لەنرخ نایەت , تۆناتوانیت بیکڕیت !)).

تەلی هەزار ووتی: (( هەرچیت ئەوێ داوای بکە )).

وەلامی دایەوە (( بهێڵە شەوێك لەگەڵتا بنومو دەستت لەگەڵ تێکەلاو بکەم ئەتدەمی !)).

_ (( ئەوەتۆ ئەڵێ ی چی ؟... تەنها لەشم پیشانی هەرکەسێك بدەم ئەوەندەی سەنگی خۆم زێڕم ئەداتێ , کەچی تۆ داوای چی ئەکەیت !)).

_ (( خانم , من پێم نەوتیت بۆت ناکڕێت ؟ من نەك ئەتوانم تەنها سەنگی خۆت زێڕت بدەمی , بەلکو ئەتوانم ئەوەندەی سەنگی کۆشکەکەت زێڕت بۆکەڵەکە بکەم ... بابڕۆم بەرێی خۆمەود ناگەینە ئەنجام)). /

سێڤدین جامەکەی هەلگرتو بەرەو دەرگاکە ڕۆیشت . تەلی هەزار لەگەل کەنیزەکەیدا ڕاوێژی کرد ... کەنیزەکەکەی پێی ووت:

_ (( خانم تۆ ئەگەر ئەم جامەت هەبێ ئەتوانی هەموو جیهانت دەست بکەوێ ... چی ئەبێ ئەگەر شەوێك لەگەڵیدا بنووی‌و چی ئەوێ لەگەڵیدا بکەی , خۆئەو شێتەو بەمەنازانێ ... چۆن ئەم جامە بەنرخە لەدەست خۆت ئەدەی ؟ )).

تەلی هەزار سێڤدینی بانگ کردەوەو هەتا بەیانی لەگەڵی نووستو چی ویست کردی. بەیانی خۆی کۆکردەوە بڕوات. تەلی هەزار پێی ووت:

_((سێڤدین... ئەگەر پێویستم پێت بوو چۆنت بدۆزمەوە؟)).

سێڤدین شوێن‌و ڕێگای خۆی پێ ووتو لێ یدا ڕۆیشتو گەیشتەوە مالێ. کەدایکی بینی لێ ی پرسی:

_((ها کوڕه شیرینەکەم... ئەمجارە چیت کرد؟)).

_((دایەگیان ئەمجارەش خەڵە تاندیانمو بەفیڕۆ هەموو پارەکانم لەدەست خۆم دا , بەڵام یادگاریێکی باشم بەجێ هێشتووە!)).

_(( کوڕه شیرینەکەم ئینجا چی بەباوکت بڵێین؟)).

_((دایەگیان بڵێم چی, تازه ڕۆیشتو بڕایەوە, چی بکەم!)).

کە پادشا زانی کوڕەکەی گەڕاوەتەوە بانگی کرده دیوەخانو پێی ووت:

_((ئا بزانین ئەم جاره چیت کردوە؟)).

_((بابەگیان, ئەمجارەش لەگەڵ هاوڕێکانمدا پارەکانم بەفیڕۆدا!)).

پادشا هاواری کرد: ((جەللاد! هەر ئێستا سێڤدین بەره, سەری بپەڕێنەو جلە خوێناوی یەکانیم بۆ بهێنەرەوە!)).

وەزیر هاتە قسەو بەپادشای ووت:

_((پادشا خوا دەست بەباڵتەوە بگرێ , گوێم لێ بگره... پارەکەی بەفیڕۆداوه بەفیڕۆداوه... تۆ بەمە هیچت لێ کەم نەبۆتەوە... مەیکوژە, من ئەزانم هەروا بەخۆڕایی ئەمەی نەکردووە, دوایی بۆت دەر ئەکەوێتو پەشیمان ئەبیتەوە, مەیکوژە!)).

پادشا نەڕاندی : ((شتی وانیە, هەر ئەبی سەری ببڕم ... ئەو گاڵتەم پێ ئەکات!...))

وەزیر کەزانی قسە کەڵکی نیە سێڤدینو جەللادەکەی دووی خۆی خست کەگوایا ئەچن سەری ئەبڕن. کە گەیشتنە قەراغ شار جلەکانی سێڤدینی داکەندو بەجەللادەکەی ووت:

_((بڕۆ ئاسکێك بکوژه. ئەم جلانە بەە لەخوێنەکەیەوەو وەرەوە لێره چاوەڕێم بکە هەتا دێمەوە)).

جەللادەکە ڕۆیشتو وەزیـر سێفدینی بـردە کۆخێکی زۆر دوور لەشارەوە، خواردنی بۆ پەیدا کردو بەجێی هێشت.

کەهاتەوە شوێنی پێشوو جەللادەکە بەجلە خوێناوی یەکانـەوە چاوەڕێی ئەکرد. وەزیر پێی ووت: (( نەکەی وورتە لەدەمت بێتـە دەرەوە پـێی بڵـێ کە سەرت بڕیوەو ئەمەش خوێنەکەیەتی))

هاتینەوە لای پادشا. کەجلە خوێناوی یەکانیان پیشاندا هێمن بووەوە.

وەزیـر هـەموو جارێـك ئەچوو بـۆلای سێفدین‌و چی پێویست بوایە بـۆی ئەبرد.

بائـەمان لێـرە بـەجێ بهێڵین‌و بـزانین تـەلی هـەزار خـەریکی چـی یـە.کـە هەستی کـرد سـکی خەریکـە بـەرز ئەبێتـەوە بـیری کـردەوە: ((ئـەی هـاوار بەماڵم چی بکەم... خۆ باوکم بزانێ ئەمکوژێ!)).

کەنیزەکەی بانگ کردو پێی ووت:

_(( ئەمە هەمووی فیتی تۆ بوو، بەقسەی تـۆم کـرد بۆیـە وام بەسـەرهات، باوکم بزانێ هەردووکمان ئەکوژێ، تەکبیرێك بکە، چی بکەین؟))

کەنیزەکـە پـێی ووت: ((تــەنها چـارەیەك هەیــە .... ئــەویش ئەوەیــە کەسـێفدین بدۆزیتـەوەو شـووی پـێ بکـەیت. تـۆ بەشـێتت زانـی کەچـی لەهەمووەمان ژیر تر بوو!)).

_((ژیری چی بوو؟))

_((چۆن ؟... سکی پڕکردیت‌و ئێستا ناچاریت تۆ دووی ئـەو بکـەویت نـەك ئەو دووی تۆبکەوێت، ئەوساش کیتەڵەو سفرەو جامەکە دووبـارە ئەبێتـەوە بـەهی خـۆی، سـەرەڕای ئەمـە تۆشـی دەسـت نەکـەوێ، ئایـا ئەمـە ژیریـی نیە؟)).تەلی هەزارە ووتی : (( تۆ ڕاست ئەکەیت، ئەبێ بچین بۆلای)).

فەرمانی دا ئەسپیان بۆ زین كرد. كیتەڵەو سفرەو جامەكەی لەگەڵ خۆی هەلگرتو ڕۆیشت . كەگەیشتە قەراغ شاری سێفدین باری خستو فوویەكی لەگۆزەكە كرد ئەوناوە پڕبوو لەلەشكرو سەركردەی لەشكرەكە پێی ووت:

_((خانم, فەرمانت بەچیە, جیهان تێك بدەین؟)).

_((جیهان وەستاوەو ئێمەی لەسەرین, ئیتر بۆچی تێكی بدەین؟.. گەمارۆی ئەم شارە بدەو مەیەڵە كەسی لێ بچێتە دەرەوەو چاوەڕێی فەرمانم بكە!)).

ئەوەندەی بڵێ ی یەكو دوو شار گەمارۆ درا.

بەیانی ڕابەری ناردە لای پادشاو پێی ووت: (( یەك ڕۆژ مۆڵەت بێ ... لەم ماوەیەدا سێفدینم بۆ ئەنێرێ باشە, ناینێرێ شارەكەیان كاول ئەكەم)).

كە ڕابەرەكە ئەمەی بەپادشا ووت, وەڵامی دایەوە:

_((پێی بڵێ باشە , فەرمانی بەجێ ئەهێنم)).

پادشا بەپەلە ناردی بەشوێن وەزیرداو باسەكەی بۆ گێڕایەوە. وەزیر پێی ووت:

_(( پادشام, پێم نەووتیت مەیكوژە؟ ئێستا چی بكەین؟ سەیرێكی دەرەوەی شاربكە, بەجۆرێك گەمارۆ دراوین چۆلەكە ناتوانێ دەربچێت)).

_(( باكوڕە گەورەكەم بنێرم بۆلای تەلی هەزار لەباتی سێفدین)).

پادشا كوڕەگەورەكەی نارد. تەلی هەزار پێی ووت: ((كواسێفدین؟)).

_((من ئەوم)).

_((ئەگەر ئەویت من ئەناسیت؟)).

_(( ئەتناسم, تۆ تەلی هەزاریت)).

_((چۆنم ئەناسیت؟))

کوڕەکە نەیتوانی وەلام بداتەوەو بێ دەنگ بوو, کە تەلی هەزار زانی خەلەتاندوویانە فەرمانی دا دەستی کوڕەکەیان بەستەوەو ناردیەوە لای پادشا. ئەوسا پادشا کوڕە ناوەنجی یەکەی بۆ نارد. تەلی هەزار ئەویشی بەهەمان شێوە ناردەوەو ڕایسپارد بەپادشایان ووت:

_((ئەگەر هەتا ئێوارە سێڤدینم بۆ نەنێرن شار کاول ئەکەم‌و بەردی بەسەر بەردی یەوە ناهێلم)).

پادشا هانای بردە بەر وەزیرو پێی ووت:

_(( کەئەوسا پێم ووتیت بەقسەت ئەکردم‌و سێڤدینت کوشت, ئێستا چیم پێ ئەکرێ؟)).

ماوەی مۆلەتەکە بەسەر چوو و, کەسێڤدین دیارنەبوو تەلی هەزار فەرمانی بەسەرکردەکەدا:

_((لەهەر چوارلاوە دەست بکەن بە کاول کردنی شار!)).

لەشکر لەهەموو لایەکەوە هێرشی بردو دەستیان کرد بەکاول کردنی شارو کوشتنی دانیشتوانی.

خەلکەکە هانایان بردە بەر پادشا پێ یان ووت:

_((تۆ پادشای ئێمەی , چۆن ڕێگانەدەی وامان لێ بکەن کەسیان نەهێشتین‌و شاریان وێران کر)).

وەزیر بەپادشای ووت:

_((من خۆم ئەچم بۆلای تەلی هەزار))

وەزیر چووبۆلای سێڤدین‌و پێی ووت:

_((هەتا زووە خۆت بگەیەنە لای تەلی هەزار ئەگینا هەموو شار وێران ئەکات)).

سـێڤدین هاتــەوە ناوشــار , کەسـەر کـردەی لەشـکرەکەی چـاوپێ کـەوت ناسیەوەو شەڕی وەستاند. سێڤدین چوو بۆ لای تەلی هەزارو پێی ووت:

_((خانم, چیت لەمن ئەوێ؟ کیتەڵەت لێ سەندم... سفرەت لێ سەندم... چی ترت لێم ئەوێ؟)).

تەلی هەزار پێی ووت:

_((سکت پڕ کردووم ئێستا ئەبێ مارەم بکەیت!))

سێڤدین پێی ووت:

_((بەسەری تۆو باوکت من ئەوە ناهێنم تۆ شوم پێ بکەیت تۆ هـەزار زێـڕ ئـەدەن تـەنها بـۆ ئـەوەی پەنجەیـەکت ببیـنن... منـی شـێتو وێـت لـەکوێ شایانی ئەوەم ببمە مێردی تۆ؟)).

کە تەلی هەزار زانی کەڵکی نیە بەکەساسی یەوە پێی ووت:

بمکوژەو لێرە بمنێـژە بـا ئـابڕووم نەچێت... باخـەڵك بـزانن کـە بەدەسـتی مێردەکەم کوژراومو نێژراوم!)).

سێڤدین ووتی: ((من هەتا پرس بەباوکم نەکەمو ڕێگام نەدات ناتوانم هیچ بکەم)).

تـەلی هـەزار نـاردی بـەدوای پادشـادا , بەکەنیزەکەکەشـی ووت کـە خـۆی بەدایکی بدات لەقەڵەمو قسە لەگەڵ پادشادا بکات.

کەپادشا هات کەنیزەکەکە هەمووباسـەکەی بـۆ گێڕایـەوە, پادشـا زۆر پـێی خۆش بوو کەنازدارێکی وەك تەلی هەزار خۆی داوابکات ببێ بەبووکی.

پادشا ڕازیبوو . بۆبەیانی شایی‌و زەماوەند ڕێك خراو حەوت شەوو حـەوت ڕۆژ درا لەتەقەی دەهۆڵو زوڕنا. خۆزگە ئێوە دایكو باوکیشتان لەم شاییە

شـتێکتان دەسـت بکەوتایـە. ئـەوان بـەئاواتی خۆیـان گەیشـتن‌و هیـوادارم ئێوەش بە ئاواتی خۆتان بگەن...!.

# ناوەرۆك